


# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسێن شێخ سعدی

ئامادەکردنی بۆ چاپ
بشیر حسێن سعدی
جێگری داراکاری گشتی

لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە

بەرگی نۆیەم

# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری


دانەر

**مەلا حسێن شێخ سعدی**

ئامادەکردنی بۆ چاپ

**بشیر حسێن سعدی**

جێگری داواکاری گشتی


لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە

**بەرگی نۆیەم**




ناوی کتێب : پرشنگی رۆژی کوردەواری لە شەرحی بوخاری

ئامادەکردنی بۆ چاپ : بشیر حسێن سعدی.

بەرگی : نۆیەم

ساڵی چاپ : ١٤٢٣ك - ٢٠٠٢ز

کۆمپیوتەر : نووسینگەی تەفسیر.

ئەرکی چاپ: نووسینگەی تفسیر .

چاپ کردنی : ئۆفسێتی هەولێر .

ژمارەی سپاردن : ٢٣٨ لە ساڵی ٢٠٠١ .

بەردەستتان هەشت بەرگم لیٚ چاپ کردووە لە کۆی دە بەرگ.

٣- دیوانی فانی-هەڵبەستەکانی کە نازناوی لە ئەدەب (فانی) بووە لە ساڵی ١٩٨٤ لە چاپخانەی (رۆشنبیری) لە هەولێر بەچاپم گەیاند پاش کۆکردنەوەی هەڵبەستەکانی کە بە کوردی و فارسی‌یە لە چەند کاغەزی پرش و بڵاو و بەیاز و لە دامەنی هەندێ پەرتووکان نووسیبوویەوە، بەڵام بەداخەوە لەوکاتەی (صالح زکی بگ) متصرفی هەولێر بووە لە ساڵی ١٩٤٠، بەشی زۆری هەڵبەستەکانی لە دەفتەرێك نوسیبۆوە، لێی وەرگرتبوو بۆ خوێندنەوە نەی‌داوەتەوەو بەسەردا گوێزراوەتەوە لە هەولێر بۆ شوێنێکی تر، لێرەدا بەشی زۆری هەڵبەستەکانی بزر بوون.

٤- (تەرجەمەی قەصیدەی بوردیە): ئەوەشیان تەرجەمەی قەسیدەی بوردیەیە لە عەرەبیەوە بۆ کوردی لەسەر هەمان کێش و سەروا کە دانەرەکە بە عەرەبی (شێخ محمدی بوصیری) مصری بووە. هەتا ئێستا بە سەرکەوتووترین تەرجەمەی ئەم قەسیدەیە دادەنرێ بۆ سەر زمانی کوردی.

بەم شێوەیە هەتا ئێستا (١٦) پەرتووکم لە دانراوەکانی بە چاپ گەیاندووە.. هێشتا دانداوی تریشی هەیە وەکو ئەمانەی خوارەوە کە هێشتا بەچاپ نەگەیەنراون:

١- حقائق الخیام: تەرجەمە و شرۆڤەکردنی چوارینەکانی خەیامە لە فارسیەوە بۆ عەرەبی.

٢- شەرحی ذات الشفا: ئەم پەرتووکەش شرۆڤەکردنی (ذات الشفا)یە کە بە عەرەبی داندراوە لە-سیرەت و سەربردە و ژیانی پێغەمبەری گەورەمان (محمد) درودی خوای لەسەر بێ، بۆ سەر زمانی کوردی.

٣- شەریعەتی ئیسلام لە چوار مەزهەب/ داندراوێکە بە کوردی یەك بەرگە.

٤- شەرحی جامع الصغیر، بەکوردی سێ بەرگە.

٥- مێژووی ژیانی هەندێ لە خواجەکانی نەقشبەندی.

٦- شەرحی چوارینەکانی باباتاهیری هەمەدانی بە کوردی شێوەی سۆرانی لە لوڕی‌یەوە.

٧- شەرحی لەمەعات لە فارسی بۆ عەرەبی کە داندراوی شێخ فخرالدین عەتارە.

٨- (نەظمی تهذیب المنطق) کە داندراوی (سەعدی تەفتازانی)یە.

٩- شەرحی لەوائح لە فارسی بۆ عەرەبی.

١٠- مەنظومەی تەوحیدیەی فریدالدین عەتار، تەرجەمەکردنی لە فارسی بۆ عەرەبی.

١١- المنظوم في العقود، بەعەرەبی لە فقهی شافیعی.

١٢- پەرتوکی (بەلاغەت) بە عەرەبی.

١٣- منهج الحقیقة لە تصوف بە عەرەبی.

١٤- رازەکانی قورئان (أسرار القرآن) بە کوردی.

١٥- شهادات الأجانب، بە عەرەبی.

**مامۆستاکانی:**

ئەو مامۆستا بەڕێزانەی مەلا حسێنی فانی لای ئەوانی خوێندووە ئەمانە بوون:

١- مامۆستا مەلا ابراهیمی بێشەیی.

٢- مامۆستا مەلا عبداللە ی جەلیزادە.

٣- مامۆستا مەلا صادق ئیمامی مزگەوتی جامی لەکۆیە.

٤- مامۆستا مەلا ئەسعەد أفندی أربیلی.

٥- مامۆستا مەلا ئەحمەدی سکتان.

٦- مەلا ئەبوبکر عمر افندی کە بە مەلا افندی ناسراوە خوێندویە و اجازەی مەلایەتیشی لای ئەو وەرگرتووە..

هیوادارم لە داهاتوویێکی نزیك ئەو دەست نووسانەی کە ماون ئەوانیش بەچاپ بگەیەنم بۆ خزمەتی ئاینی ئیسلام و ئەدەبی کوردی..

٢٠٠١/١٢/١

## فەرمودەی خودا

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾

**١٠٦٩: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ الَى الرَّحمنِ خَفِيفَتَانِ على اللِسان ثَقِيلَتَانِ فِي المِيزَانِ؛ سُبْحانَ الله وَبِحَمدِهِ سُبْحانَ الله العَظِيم..**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**سُبْحانَ الله وَبِحَمدِهِ سُبْحانَ الله العَظِيم**) دوو جوملەی خۆشەویستی خـودای زۆر زۆر بەمەرحەمـەت و میهرەبانی‌یـە، دوو جوملەی سووکن لەسەر زمان و گرانن ڕۆژی قیامەت لە تەرازووی چاکە و خراپە.

واتاکەی ئەمەیە (تەنزیهی خودا دەکەم-یەعنی خودا پاك ڕادەگـرم- لـە سماتی حدوث و هەموو نەقصێك لـە نیشـانەکانی تازەبوونـەوەو دروسـت کراویـدا و هـەموو کەمی‌یـەك.. وە تەقدیسی خودای عظیم الشأن دەکەم لە هەموو شتی نالایق (خودای گـەورە بـەپیرۆز و گـەورە رادەگرم لە هەموو شتێك کە لەو نەوەشێتەوە)

## سورەتی ( نساء )

**١٠٧٠: عَنْ عَبْدِاللَّهِ: قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْرَأْ عَلَيَّ، قُلْتُ: آقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى بَلَغْتُ ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاءِ شَهِيدًا﴾ قَالَ: أَمْسِكْ، فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ.**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی مەسعود ﷺ گوتـی: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: قورئـانم بـۆ بخوێنە هەتا گوێ بدەمێ. گوتم: ئایا من قورئان بۆ تـۆ بخوێنـم، کـە هـەر بـۆ تۆیـش قورئـان ناردراوەتە خوارێ؟ فەرمووی: پێم خۆشە لە غەیری خۆم گوێم لی‌بێ. منیش سوورەتی (نساء)م بۆ خوێندەوە، هەتا گەیشتمە ﴿**فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاءِ شَهِيدًا**﴾: ئایا چلۆن دەبێ ئـەحواڵی عالـەم وەکـوو لەهـەر ئومـەتێك و نەتەوەیـەك هێنامـان پێغەمبەرەکەیان بەشاهید لەسەریان، وە تۆیشمان هێنا بەشاهید لەسەر ئەمانەی کە ئومـەتی تۆن.. لەناکاو دیتم فرمێسك لە دووچاوی پیرۆزی هەڵڕژا خواری. فەرمووی: بەسە مەخوێنە.

(ش): گریـانی پێغەمبـەر ﷺ یـاخۆ لەبـەر غـەمناکی لەسـەر درێغی‌کـردن و قصـوری

گوناهکاران بووه یاخۆ لەبەر ئەوە بووە کە لە ئایەتەکە هاتووەو باس کراوە، لە ناخۆشـــیەکانی گەورەگەورە. یاخۆ گریانی کەیف خۆشی بووە، چونکی خودای گەورە ئومەت و نەتەوەی ئـــەوی گێڕا بە شاهید لەسەر هەموو نەتەوەکانی تر.. هەروەکو شاعیری عەرەبی گوتیتی:

طَفَحَ السّرورُ عَلَيَّ حتّى أنّهُ          منْ عَظيمِ ما قدْ سَرَّني أبكاني

واتا: هەندە کەیف خۆش بووم، لەبەر زێدە کەیف خۆشیم گریانم هات.

## فەرمودەی خودا

﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾

١٠٧١: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى فَقَدْ كَذَبَ..

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەرکەسێك بڵێ من باشترم لە یونس کوڕی مەتا سەلامی خوای لێبێ، بەڕاستی درۆی کردووە.

(ش): واتا لایق نییە بۆ کەسێك ئەم قسەیە بکا.

پێچەوانە نییە لەگەڵ حەدیسی ((أنا سيد ولـــد آدم)) کـە شـتێکی ڕۆن کردووتـەوە لـە شـوێنی بەچاکـەزانین و ئاگادارکردنـەوەی ئومـەت بـە حەقیقـەتی حـاڵ. چونکـە مەبەسـتی پێغەمبەرﷺ لێرە توازعی خۆی و نەهێشتنی وەهمی ئەو کەسانەیش بووە کە فکریان بۆ کەمی مەرتەبەی یونس چووبێ لەبەر ئایەتی ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلاَ تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُـــوتِ﴾. بۆیێ زیاد لە پێغەمبەران لەچەند جێگایتر مەدحی یونسی کردووە.

## سورەتی (مائدة)

﴿لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾

١٠٧٢: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ تَعْلَمُونَ مَـا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا.. فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە گوتی: پێغەمبەرﷺ دوانێکی ئەمەندە بـە تەئسـیری خوێندەوە، قەت خوتبەو دوانی وا نەبیسترابوو، فەرمووی: ئەوی من دەزانم ئەگەر ئێوە بـیزانن

بەراستی کەم پێدەکەنن و زۆر دەگرین.. ئینجا ئەصحابی پێغەمبەر لەبەر تەنسیری ئامۆژگاریەکان رووبی خۆیان داپۆشی وە دەستیان بەگریان کرد. پاشان پیاوێك کە عبداللە ی کوڕی حوذافه بوو(شکی ئەوەی لێدەکرا کوڕی باوکی نەبێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا باوکی من کێیە؟ فەرمووی: حوذافیە، پاشان چەند کەسێکیتر چەند پرسیارێکی بێمەقصەدیان لیکرد. پێغەمبەرﷺ لەبەر میهرەبانی بەحالی موسولمانان، نەوەك واجباتی شەرعیان لەسەر زیاد بێ، حەزرەتی عومەر عاجزیەکەی لێ هەست پێکرد، پێی فەرموو: ((رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الْفِتَنِ)) واتا رازین بەوەی کە یەزدان خودامان بێ وە ئیسلامەتی ئایینمان بێ وە محمد پێغەمبەرمان بێ وە خۆمان دەپارێزین بەخودا لە خراپەی فیتنە و بەدکاری.. ئینجا ئەم ئایەتە ﴿لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ هاتە خوارێ، یەعنی: ئەی ئەصحاب، سوئال لە پێغەمبەر مەکەن لەو شتانەی ئەگەر بۆتان بەدیار بخرێ ئێوە بخاتە ئەزیەت لەبەر زۆربوونی تەکالیفی شەرعیە.

## سورەتی أنعام

## لە فەرمودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا﴾

١٠٧٣: عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، هَذَا أَهْوَنُ أَوْ أَيْسَرُ.. قَالَهُ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللە ی ئەنصاری‌ؓ گوتی: وەکوو هاتە خوارێ ئایەتی ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ﴾ واتا: خودا تەوانایە کە بنێرێتە سەرتان عەزابێك لەلای سەرەوەتان. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەزاتی تۆ خۆم دەپارێزم لەم عەزابە، ﴿أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ یەعنی یاخۆ عەزابێك بنێرتە سەرتان لەلای خوارەوەتان، دیسان پێغەمبەرﷺ فەرمووی : (أَعُوذُ بِوَجْهِكَ) واتا بەزاتی تۆ خۆم دەپارێزم لەم عەزابەیش، ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ﴾ دیسان فەرمووی: (أَعُوذُ بِوَجْهِكَ)، پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم فتنەی عەزابدانی یەکتریتان لەدونیا ئاسانترە لە عەزابی خودای گەورە.

(ش): دەگێڕێتەوە ئیمامی ئەحمەد لە حەدیسی ئوبەی کوڕی کەعب لەم ئایەتە ﴿هُنَّ أَربَعٌ

و كُلُّهُنَّ واقع لا محالة﴾ واتا: ئەم حەدیسە چوار کلمەیە کە هەر یەکێك واتەی عەزابێك دەگەیەنێ بە تەحقیق و بەڕاستی دەبێ هەموویان بێنە جێ. لە حەدیسی ئەحمەد زاندرا کە ئەم ئایەتە ئاگادارکردنە بە سێ نادیار(غەیب) لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ نەهاتوتە جێ، بۆیێ لە حەدیسێکی تریش ﷺ فەرموویەتی: ((أمّا إنّها كائنةٌ ولَم يأتِ تأويلها بَعد)). بەڵام لە شەڕی گەورەی جیهانی وە لە تەئریخی ١٣٣٢ هەزار و سێسەد و سی و دوویی هیجری رووی دا. تا زەمانی نووسینی ئەم دێرانە کە ساڵی ١٩٥٢ هەزار و نۆسەد و پەنجاو دووی میلادییە، وە ساڵی ١٣٧٢ هەزار و سێسەد و حەفتاو دووی هیجریە، ئەم چوار عەزابە هاتە جێ. بەم تەرزە لەپاش تێکەڵ یەکتری بوونی رۆژهەڵات و رۆژئاواو سەروو خواروو، بەهۆی ئامێرو ئالەتەکانی سواربون وەکوو تەیارە(فرۆکە) و بەهۆی پاپۆڕەکانی دەریا و ژێر دەریا(غواصە) وە بەو قونبولانەی دەشرێنەوە لەژێر عارد(ئەلغام)، بەجۆرێك گرفتار بوون بەم عەزابانە، کە خوێنی بەدەنی ئینسان لەزۆر جێگای دونیا لە رژاندندایە.. مەعنای حەدیسی (أما إنّها..الخ) یەعنی ئاگاداربە ئەم چوار عەزابانە راستن و سابیتن، بەڵام هێشتا نەهاتوتە جێ.

## فەرموودەی خودا

﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾

١٠٧٤: عَنْ عَبْدِاللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لا أَحَدَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ فَلِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلا أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّهِ وَلِذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عەبداللە ی کوڕی مەسعود ﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتە گوتیتی: هیچ کەسێك لەخودا بەغیرەت ترو بە حەمیەت تر نییە، بۆیێ گوناهەکانی بە ئاشکرا و بەدزی گێڕاوە بە حەرام و قەدەغەکراو، چونکی هەرچی گوناهە ئیشی چرۆکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویتی: ((إنَّ اللهَ يحبُّ الأمورَ العالية ويَكرهُ سَفاسفها)) واتا خودای گەورە صفاتی بەرزە بەشەرەفی لا خۆشەویستە وە رقی لە صفاتی چروك دەبێتەوە، وە خودای گەورە هیچ شتێکیشی لە مەدحی خۆی لا خۆشەویست تر نییە، یەعنی زۆر پێی خۆشە خەڵکی سوپاس و ستایشی بکەن، بۆیێ خۆشی مەدح و ستایشی خۆی کردووە، لە کەلامی مەجیدی خۆی لە قورئان کە دەڵێ ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾، ﴿سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، ﴿تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾، و غەیری ئەمانەیش.

(ش): خودا کە پێی خۆشە عالەم مەدحی بکا بۆ کەڵك وەرگرتنی خەڵکییە، ئەگەر نا گەورەیی خودای گەورە چونکی بڵندترە بەزاتی ئەقدەسی خۆی لە کەڵك وەرگرتن بەهیچ شتێکی عالەم بێنیازە لە عالەم کە مەدحی بکەن.

## سورەتی (تەوبە)

## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾

(عسى) لەلایەن خودا بە مەعنای وجوبە، (ابن كثير) گوتیتی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەگەرچی دەرحەق بە چەند كەسانی دیاركراوە، بەڵام مەبەست عامە لە هەموو گوناهكارانی ئومەتی ئیسلام.

١٠٧٦: عَنْ سَمرَةَ بْنُ جُنْدَب رَضِيِ اللّٰهُ عَنهُ، قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَان فَابْتَعَثَانِي فَانْتَهَيْنَا بِي إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ فَتَلَقَّانَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، قَالاَ لَهُمُ اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهْرِ، فَوَقَعُوا فِيهِ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ، فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ قَالاَ لِي: هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ، قَالاَ: أَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وَشَطْرٌ مِنْهُمْ قَبِيحٌ، فَإِنَّهُمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللّٰهُ عَنْهُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەمرەی كوڕی جەندەب‌ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئیمشەو لە خەونی خۆم دیتم دوو كەس هاتنە لام، منیان بەخێرهێنا لەخەو، پاشان بۆ شارێكیان بردم قەسرەكانی هەموو دروست كرابوو بە خشتێك لە زێڕ و خشتێك لە زیو، پاشان چەند كەسانێكمان تووشبوون نیوەی ئەندامیان وەكوو شیرین ترینی ئەو شتانە بوو كە دەیانبینی، نیوەی تریشیان وەكوو ناشیرین ترینی ئەو شتانە بوو كە دەیانبینی، ئەو دوو كەسە پێ‌یان گۆتن: بچۆنە نێو ئەو ڕووبارە، ئینجا چوونە نێو ڕووبارەكە، پاشان بۆ لای ئێمە گەڕانەوە هیچ ناشیرینی‌یان نەمابوو، وەك لەسەر چاكترین صورەتان بوون، پێ‌یان گوتم: ئەم شارە (جنە العدن)ە، ئەوێـهێش قۆناغی تۆیە، وە ئەم قەومەی كە لایەكی‌یان جوان بو لایەكیشیان ناشیرین بوو، ئەو ئیماندارانەن كە كاری باش و بەدیان تێكەڵ یەكتری كردووە، بەم تەرزە كاری چاكیشیان كردووە و گوناهیشیان كردوونە؛ خودای گەورە بەچاكەی خۆی لی‌یان خۆش بوو، فكر دەچێ ئەمانە ئەهلی ئەعراف بن بە قەرینەی وەكوو یەك بوونی چاكەو خراپەیان.

## له تەفسیری ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾

١٠٧٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ، وَقَالَ: يَدُ اللَّهِ مَلأَى لا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءٌ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ. وَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَاءَ وَالأَرْضَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَدِهِ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ .

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە فەرمویەتی: تۆ لە خواپەرستی ماڵ سەرف بکە، منیش لە جەزای ئەو ماڵ بەتۆ دەبەخشم. فەرمووی خەزێنەکانی خودای گەورە پڕە لە بەخشین کەمی ناکا هەرکات لە هەڵڕژان دایە بەشەوو بەڕۆژ، فەرمووی: ئێوە پێم بڵێن سەرەتای ئیجادی ئاسمان و عارد وە ئەوەی کە سەرفی کرووە لەسەر ئەم عالەمەو بە مەخلوقاتی خۆی بەخشیوە هیچ شتێکی کەم نەکردووە لە خەزێنەکانی ئەو. تەختی سەڵتەنەت و دەسەڵات داری ئەو لەسەر ئاو بوو لەپێش ئاسمان و عەرد، یەعنی هیچ ئەشیایەتو نەبوو عەرش و ئاو نەبێ، تەرازووی عەدلیش هەر بەدەست خۆیتی، نوی دەکا هەرکەسێك هەوەسی لیێ بێ، وە هەرکەسێکیش حەز بکا بلندی دەکا. دەربارەی ڕزقیش هەرکەسێك بیەوێ زۆری پێ‌دەدا لە هەندەکانیش کەم دەکا، ئیتر هەر بەم تەرزە لە هەموو ئەحوالێك.

## فەرمودەی خودای گەورە

## ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى﴾

١٠٧٦: عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ قَالَ ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبو موسی عبداللەی کوڕی قەیسی ئەشعەری خودا لیێ خۆش بێ، گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی و بە تەحقیق خودای گەورە مۆڵەتی ستەمکار و زاڵم دەدا، هەتا لەناکاو دەیگری قوتار نابی لە چەنگی، ئەگەر کافر بی هەتاهەتایە ئەگەر مسلمانیش بی هەتا ماوەی جنایەت و تاوانەکانی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ یەعنی: بەم تەرزەیە گرتنی بەخێوکەری تۆ، وەکوو دێهاتەکانی زاڵم بگرێ بێ‌گومان گرتنی بەخێوکەری تۆ بە ئازارە و سەختە..

## فەرموودەی خودا

﴿إلاَّ مَنْ استَرَقَ السَّمْعَ...الآية﴾

١٠٧٧: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ، فَإِذَا ﴿ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا﴾: لِلَّذِي قَالَ: ﴿الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾، فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هَكَذَا وَاحِدٌ فَوْقَ آخَرَ.. فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ بِهَا إِلَى صَاحِبِهِ فَيُحْرِقَهُ، وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا إِلَى الَّذِي يَلِيهِ، إِلَى الَّذِي هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ، حَتَّى يُلْقُوهَا إِلَى الأَرْضِ، فَتُلْقَى عَلَى فَمِ السَّاحِرِ فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ فَيُصَدَّقُ، فَيَقُولُونَ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا يَكُونُ كَذَا وَكَذَا؟ فَوَجَدْنَاهُ حَقًّا لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە حوکمی فەرموو بە پەیدابوونی کارێك لە کاران لە ئاسمان. مەلائکە (فریشتە) بە تەواوی گوێڕایەڵی و مل کەچن، باڵەکانیان لێك دەدەن، لەبەر فەرموودەکەی خودا کە دەبێت بە دەنگی زنجیرێکی بکەوێتە سەر بەردێکی ڕەق و لووس، لە هەیبەت و ترسان، پاشان وەکوو ترسەکەیان لەسەر دڵ لاچوو، بە مەلائکەکانی نزیك دەڵێن وەکو جوبرائیل و میکائیل و ئەوانی‌تر: پەروەردەکەری ئێوە چی فەرموو؟ پێیان دەڵێن: فەرمانێکی ڕاستی فەرموو، هەر ئەو بڵندە بە شەئنی خۆی لە صفەتەکانی عالەم و گەورەیە. پاشان ئەو شەیتانانەی کە هەوراز چووینە، بۆ دزینی قسەی ئاسمانی فەرموودەکەی خودا دەبێێن. کە ئەو شەیتانانەش بە کەڵەکە، بەم تەرزە یەك لەسەر یەکتر هەوراز چووینە، ئنجا زۆر وادبێ بلێسەی ئاگری تووش دەبی، لەپێش پێڕاگەیاندنی تەبلیغی فەرموودەکەی خودا بە ڕەفیقەکەی بنەوەی دەی سوتێنێ، واشدەبێ بلێسەی ئاگری توش نابێ هەتا فەرموودەگەی خودای گەورە بە ڕەفیقەکەی دەگەیەنێ بەوی گە دەبنە خۆیتی، ئەویش دەیگەیەنی بەوی کە لە بن خۆیتی، ئیتر هەر بەم تەرزە کلمەی خودای گەورە دێتە خوارێ هەتا دەگاتە عارد، لەپاشان ئەخرێتە دەمی جادووکەرێك و ئەستێرەناسێك(مونەجیم) پاشان جادووکەرەکە سەد درۆ ئەخاتە سەر کەلیمە ڕاستەکەی ئاسمانی، ئنجا بە واستەی کلمە ڕاستەکە ئەو درۆیەکانی تەصدیق دەکرێ. ئنجا ئەوانەی گوێیان لە ساحیرەکە گرتووە دەڵێن: ئەدی فلان ڕۆژ فلان جادووکەر خەبەری بە ئێمە نەدا، فلان ئیش وا دەبێ، ئەوا قسەی جادووکەر بەڕاستی هاتە جێ وە قسەکەی ڕاست بوو لەبەر کلمە ڕاستەکەی ئاسمانی.

(ش): هەروەکوو لە سوورەی (حِجْر) فەرموویتی: ﴿وَحَفِظْنَاهَا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ

رَجيمٍ(١٧)إلاّ مَنْ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِينٌ﴾ يـەعنی ئێمـە ئاسمانمـان پاراسـت لـە هەموو شەیتانی دەرکراو مەگەر شەیتانێك کە بۆ دزینی قسـە لـە مەلائیکـە نـەبێ، ئـەویش تووشی ئاگرێکی ئاشکرا دەبێ دەیسوتێنێ ئنجا یا لە پێش تەبلیغ بە ڕەفیقەکەی بنەوە. لـەم صورەتە قسەی ئاسمانیناگاتە عارد، یاخۆ لەپاش تەبلیغ دەیسـووتێنێ لـەم صورەتـە قسـەکە دەگاتە عارد. لەپێش لەدایك بوونی بەرزترینی عالەم محمدﷺ کاهن و جادوکەر زۆر بوو، بـەلاّم لەپاش لەدایك بوونی ئەو، لەبەر سەرنەکەوتنی شـەیتانەکان بـۆ ئاسمـان بـە تـەواوی دەرگـەی کاهینانی(کهانە) کلیل درا، بە دەلیلـی ئایەتـە پیرۆزەکـانی قورئـان و حەدیسـە پیرۆزەکـانی پێغەمبەرمان محمدﷺ.

## سورەی (نەحل)

## ﴿وَمِنكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾

١٠٧٨: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُـو أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَالْكَسَلِ وَأَرْذَلِ الْعُمُرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەس گوتی: پێغەمبەرﷺ لەبەر خودا پاڕاوە دەیگوت: خۆم دەپارێزم بـە تۆ خودایا لە بەجێنەگەیاندنی حقوقی ماڵ، وە لـە سسـتی و تەمبـەڵی، وە لـە ناخۆشـترینی ژیانان کە تەمەنی نەوەد ساڵیـە، وە لـە عـەزابی نێـو قـەبر، وە لـە قسـەی دەجـال، وە لـە تاقیکردنەوەکانی زەمانی ژیان و کاتی مردن لە روح کێشان.

## لەسورەی (اسراء)

## فەرمودەی خودای گەورە

## ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾

١٠٧٩: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذَلِكَ، يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ الْأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيـدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَـا لا يُطِيقُونَ وَلا يَحْتَمِلُونَ، فَيَقُولُ النَّاسُ: أَلا تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلا تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: عَلَيْكُمْ بِآدَمَ.. فَيَأْتُونَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلام فَيَقُولُونَ لَـهُ: أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَمَرَ الْمَلائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْـفَعْ

لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلا تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ.. فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ.. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلاثَ كَذِبَاتٍ، نَفْسِي، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى..

فَيَأْتُونَ مُوسَى فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَضَّلَكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلامِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ.. فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ: يَا عِيسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ عِيسَى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ قَطُّ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذَنْبًا، نَفْسِي، نَفْسِي، نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ.. فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَخَاتِمُ الأَنْبِيَاءِ، وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ، فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ.. فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: أُمَّتِي يَا رَبِّ، أُمَّتِي يَا رَبِّ، أُمَّتِي يَا رَبِّ، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لا حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْبَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى.. قوله تعالى: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مـن گـەورەترینی ئـادەم و

ئەولادی ئادەمم رۆژی قیامەت، ئەریٚ دەزانن لەبەرچی وایە؟ یەعنی سەبەبی گەورەیی مەر چی‌یە؟ سەبەبەکەی ئەمەیە: خودای گەورە مەخلوقاتی پێشوو پاشوو هەمووی کۆدەکاتەوە لە عاردێکی فرەوان و ڕاست، ئەوەی کە دەعوەتی عالەم دەکات دەنگی خۆی دەخاتە گوێی هەموو کەسێك دەبینیٚ، رۆژیش نزیك دەبیٚ لە ئەهلی مەحشەر(لە حەدیسی راستی سلمان گەرمایی بیست سالّی پیٚ دەدرێتەوە بەقەدەر دوو کەوانان لە کاسەی سەری مەخلوقات دوورە. لە حەدیسی ابن مبارەکیش دەلّیٚ گەرمایی ئەو رۆژە زیان بە ئیماندار ناگەیەنیٚ). غەم و سەختی‌یەك تووشی خەلّك دەبیٚ تا قەت و تەحەمولیان نامێنیٚ، خۆیەخۆیی دەلّێن: ئەریٚ نابینن چیتان تووش بوو؟ ئەریٚ تەماشا ناکەن؟ ئایا کیٚ تکایێکتان بۆ دەکا لای بەخێوکەری خۆتان؟ لە خەلّکی هەندێك بە هەندێکان دەلّێت: بەتەواوی پەنا ببەنە بەر ئادەم، تەشەبوسی پیٚ بکەن.. دێنە لای ئادەم سەلامی خوای لیٚ‌بیٚ، دەلّێن: تۆ باوکی هەموو مرۆڤایەتی و ئینسانی، خودای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی تۆی دروست کردووە، ڕووحی خستۆتە بەر جەسەد و جەستەی تۆ، وە فەرمانی بە مەلائیکە کرد سەجدە و کڕنووشیان بۆ بەری. تکایێکمان بۆ بکە لای پەروەردەکەری خۆت، ئەدی تۆ نابینی ئێمە لە چ ناخۆشی‌یەکی گران داینە؟ ئەدی تۆ تەماشا ناکەی چیمان تووشبوو. ئادەم دەلّیٚ: بەڕاستی بەخێوکەری من رقێکی وای بوویتەوە ئیمڕۆ نە لە پێش ئێستا ئەم تەرزە رقەی بوویتەوە، نە لەپاش ئێستاش ئەم تەرزە رقەی دەبێتەوە، نەهیشی لە من کرد کە ئەم دارە نەخۆم سەرپێچی و موخالەفەشم کرد. نەفسی خۆم، نەفسی خۆم، نەفسی خۆم، سیٚ‌جار دووبارەی کردەوە، یەعنی هەر نەفسی خۆم بەڕاستی موستەحەقە تکای بۆ بکریٚ). بچۆنە لای غەیری من، بچۆنە لای نوح..

ئنجا دەچنە لای نوح، دەلّێن: ئەی نوح، تۆ یەکەم پێغەمبەرێکی کە ناردراوی بۆ ئەهلی عارد و خودای گەورە لە کتابی خۆی تۆی ناوبردووە بە بەندەیەکی ئەهلی شوکر و سوپاس کردن، تکامان بۆ بکە لای پەروەردەکەری خۆت، ئەدی تۆ نابینی ئێمە لە چی ئەحوال داینە؟ نوح دەلّیٚ: بەڕاستی بەخێوکەری من توڕەبوونێکی وا تووڕە بووە لە نەلەپێشتر ئەم تووڕەبوونە تووڕەبووە نە لەمە پاشیش ئەم تووڕەبوونە دەی‌گریٚ. بۆ منیش یەك دوعا هەبوو، ئەو دوعایەشم لە بەهیلاکدانی قەومی خۆم سەرف کرد. یەعنی دەترسم هیچ دوعای ترم قبوول نەکا، بچۆنە لای غەیری من، بچۆنە لای ئیبراهیم..

ئنجا ئەچنە لای ئیبراهیم، دەلّێن: ئەی ئیبراهیم، تۆ پێغەمبەری خودای و خۆشەویستی ئەویشی(خلیل الله) لە ئەهلی عارد، تکامان بۆ بکە لای پەروەردەکەری خۆت، ئەدی تۆ نابینی ئێمە لە چی ئەحوال داینە. ئیبراهیم دەلّیٚ: بەڕاستی بەخێوکەری من ئیمڕۆ ڕقێکی وای بویتەوە، نە لەمەپێش ئەم ڕقەی بوویتەوە نە لەمەپاشیش ئەم ڕقەی دەبیتەوە، منیش سیٚ

درۆم کردووه، یەکی‌یان گوتم: (إنِي سقيم)، دووەم گوتم: (بل فعله كبـــيرهم)، سـێیەم گـوتم: (ساره خوشكمه)، ئنجا نەفسی خۆم بەڕاستی موستەحەقی تکایە، نەفسی خۆم، نەفسی خۆم.

قسەکانی ئیبراهیم(سەلامی خوای لی‌بێ) بەڕاستی درۆ نەبوون، بەلکو تەعریزی بوون، بەلام ئەوەی دیارە بەدرۆ دەچوو، ئنجا لەبەر ئەوەی خۆم پێویستم بە شەفاعەت هەیە بۆ خۆم. لەبەر ترس و هەیبەتی رۆژی قیامەت، بە صیغەی درۆ وای تەعبیر کـرد هـەتا لـە یەقـەی ببنـەوە. بۆیێش پی‌ی گوتن: بچونە لای غەیری من، بچۆنە لای موسی..

ئنجا دەچنە لای موسی، دەڵێن: ئەی موسی، تۆ ناردراوی خـودای، تۆیـش لـە خـەڵکی‌تر گەورەتر کردووە بە سەبەب پێغەمبەرایەتی و قسەکردنت لەگەڵ خودای گەورە، تکامان بۆ بکە لای بەخێوکەری خۆت، ئەدی تۆ نابینی ئیمە لە چی ئەحوال داینە؟ دەڵێ: بەبێ گومان خودای گەورە ئیمڕۆ بە تووڕەبوونێکی وا خۆی نواندووە نە لەمەپێش بەم تووڕەبوونە خۆی نیشانداوە نە لەمەپاشیش خۆی پیشاندەدا. وە منیش بەبێ فەرمان یەکێکم کوشتووە، نەفسی خۆم، نەفسی خۆم، بچوونە لای غەیری من، بچوونە لای عیسی.

ئنجا دەچنە لای عیسی دەڵێن: ئەی عیسی، تۆ پێغەمبەری خودای و قسـەیەکی خـودای، یەعنی پەیدابوونت لە فەرمانێکی خودا بوو، بەبێ واستەیەکی عادەتی لـە کۆبوونـەوەی ژن و مێرد تۆی گەیاندە مەریەم وە روحێکی دراوە پاڵ خودای وە قسەت لەگەڵ خەڵك کردووە لەنێو لانك بە ساوایی، تکامان بۆ بکە لای پەروەردەکەری خۆت، ئەدی نابینی ئێمە لەچی ئەحوالێك داین؟ عیسی دەڵێ: بەبێ شك پەروەردەکەری من بە گەورەیی خۆی ڕقێکی وای بوویتەوە ئیمڕۆ نە لەمەپێش ئەم ڕقەی بوویتەوە نە لەمەپاشیش ئەم ڕقەی دەبێتـەوە، باسـی هیـچ گونـاهێك ناکا، نەفسی خۆم، نەفسی خۆم، نەفسی خۆم، بچۆنە لای غەیری من، بچۆنە لای محمدﷺ.

ئنجا دەچنە لای محمدﷺ وە دەڵێـن: ئـەی محمـد، تـۆ نـاردراوی خـودای لـەپاش هـەموو پێغەمبەران هاتی گریمان (بالغرض) ئەگەر بەسەهویش گوناهێك لەتۆ ڕووی دابـێ بـە نـەصی قورئان خودا لە گوناهی پێشوو پاشووی تۆی بوردووە، تکایێکمـان بـۆ بکـە لای بەخێوکـەری خۆت، ئەدی نابینی ئێمە لە چی ئەحوالێکی ناخۆشین.

ئنجا هەڵدەستم دەچم بۆ ژێر عەرشی خودای گەورە، ئەکەومە سـوجدە بـۆ پەروەردەکـەری خۆم، پاشان خودای گەورە لە سوپاس و مەدح و ستایش دەرگەیەکی وام بۆ دەکاتەوە لە پێـش من بۆ هیچ کەسێکی نەکردووتەوە، پاشان دەگوترێ: ئەی محمد، سەرت بلند بکە، پێت دەدرێ، تکا بکە شەفاعەت و پاڕانەوەت قبوڵ کراوە. سەرم بلند دەکەمەوە، ئەڵێم: ئومەتی خۆم ئـەی خودایا، ئومەتی خۆم ئەی خودایا، ئومەتی خۆم ئەی خودایا، ئنجـا دووبـارە دەگوتـرێ: ئـەی محمد، لە ئومەتی خـۆت هەرکەسـی حسابی لەسـەر نی‌یـە لـەدەروازەی بـاب الایمـن داخلـی

بەهەشتیان بکە، وە لە دەرگەکانی تریش ئەمانــە شـریکی خـەڵکانن.. پاشـان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قەسەم بەو زاتەی کە نەفسی منـی بەدەستە، بـەینی هـەردوو لادەرێـك لـە دوو دەریەکانی بەهەشت وەکو بەینی مەککەو صەنعایە کە شـاری حیمەریـەکان بـووە. یـا وەکـو بەینی مەککەو بوصرایە لەشام.. شك لە راویە شاهیدی ئەم حەدیسە پیرۆزەش ئایەتی پـیرۆزە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ یەعنی: رۆژی قیامەت بەخێوکـەری تـۆ ئـەی محمد مەرتەبەو مەقامێکت پێ دەبەخشێ کە مەقامی شەفاعەتی گەورەیە هەموو کەس سـوپاس و ستایشی تۆ دەکا.

## سورەی (کەهف)

## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾

١٠٨٠: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا إِن شِئْتُمْ: ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەرضي الله عنه گوتـی: پێغـەمبەرﷺ فـەرمووی: دەهێـنرێ رۆژی قیامـەت پیاوی گەورەو قەڵەو بەقەدەری دونیایی، ناکێشێ لە تەرازووی خێر لای خودای گـەورە لابـاڵی پێشوولەیەك. فەرمووشی بخوێننەوە ئەگەر حەز دەکەن ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَـــةِ وَزْنًـــا﴾ مەعنای ئایەت ئیشارەیە وەبال أخسر الأعمال-لە هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا- رەت بوو یەعنی أخسر الأعمال واتە خراپترینی کاران، ئینکاری ئایەتەکان و گەیشتنی پەروەردەکـەری خۆیان کرد، ئینجا کردەوەی باشیان لـە دونیـا بـەتاڵ و بێپاداشـتە. ئنجـا لـەجیاتی چاکـەی دونیایان بەقەدەر لاباڵی پێشوولەیەك پاداشت و سەوابیان پێ نادەم (چونکی تەرازوو بۆ کافران دانانرێ، بۆ ئەشقیای ئیماندار دادەنرێ، چونکە خێر و شەڕی تێکەڵە.

## سورەتی ( مەریەم )

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾

١٠٨١: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ، فَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، ثُمَّ يُنَادِي: يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، فَيُذْبَحُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلا مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلا مَوْتَ.. ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾ وَهَؤُلاءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا ﴿وَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعیدی خودری‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مردن دێتە سەر شکلی بەرانێکی ئەملەح(یەعنی سپی و ڕەش، بەڵام ڕەشاتی کەمتر بێ)، دەهێنرێ بۆ نێو مەخلوقات، بانگدەرێك بانگ دەکا: ئەی ئەهلی بەهەشت. ئەهلی بەهەشتیش ملی بۆ درێژ دەکەن و سەر بڵند دەکەن و تەماشا دەکەن بەترسەوە. ئنجا پێیان دەڵێ: ئەم بەرانە دەناسن؟ وەڵامی دەدەنەوە: بەڵێ، ئەم بەرانە مردنە. وە هەموشیان دەیناسن بەپێی ناسینی خودای گەورە. پاشان بانگدەکا: ئەی ئەهلی ئاگر، بەترسەوە تەماشای دەکەن، پاشا، پێیان دەڵێ: ئەم بەرانە دەناسن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەمە مردنە، وە هەمووشیان دەیناسن، چونکی خودا پێی ناسیون. ئنجا لە بەینی ئەهلی بەهەشت و ئەهلی ئاگر دەکوژرێتەوە( لەلایەن جەبرەئیلەوە) پاشان دەڵێ: ئەی ئەهلی بەهەشت جێگاتان هەتاهەتایە وە بێبڕانەوە بەهەشتە، وە ئەی ئەهلی ئاگر جێگاتان هەتاهەتایە وە بێبڕانەوە ئاگرە، چونکی مردن نەما.. پاشان پێغەمبەرﷺ بەشاهید لەسەر فەرموودەی خۆی ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَأَنْذِرْهُمْ ...﴾ یەعنی: ئەی محمد، خەبەر بە هەموو خەڵك بدە ڕۆژی غەمو حەسرەت کە ڕۆژی قیامەتە وەکوو ئەهلی بەهەشت ئەهلی ئاگر لێك جوداکرانەوە هەتاهەتایە هەر کۆمەڵێك لە جێگای خۆی دامەزرا، وە ئەم کافرانە لە دونیا لە غەفلەت دانەو بێئاگان لە ئەحوالی ڕۆژی قیامەت، ئیمان و باوەڕیش نایێنن بە قەتعی.

## سورەتی (نور)

## فەرمودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ﴾

١٠٨٢: عَنْ عُوَيْمِرٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ الْقُرْآنَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَأَمَرَهُمَا بِالْمُلاعَنَةِ، ثُمَّ قَالَ: فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْحَمَ أَدْعَجَ الْعَيْنَيْنِ عَظِيمَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَلا أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا إِلاَّ قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أُحَيْمِرَ كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ فَلا أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا إِلاَّ قَدْ كَذَبَ عَلَيْهَا.. فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَ مِنْ تَصْدِيقِ عُوَيْمِرٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ئەنصاری گوتی: عویمیری کوڕی حارسی عەجلانی چووە لای عاصی کوڕی عودەی عەجلانی(سەرۆکی بەنی عەجلان بوو)، پێی گوت: ئەگەر یەکێك پیاوێکی لەگەڵ ژنی خۆی دیت، ئایا ئێوە پیاوەکە ئەکوژن؟ یاخود چی حوکمێکی دەرحەق دەکەن. حەز دەکەم بۆ من بە پێغەمبەر بڵێی عەرزی بکەی. عاصمیش بۆ لای پێغەمبەر چوو، قسەکەی پێ‌گوت، پێغەمبەریش ﷺ لە پرسیارەکەی عاصم ڕوویی پیرۆزی گرژ کرد، لەترسی بڵاوبوونەوەی ئەم قسە چلکنە لەنێو عالەمی ئیسلامی، چونکی بە عەیبێکی گەورەی زانی.. عاصمیش کە ئەم گرژیەی هەست پێ‌کرد لە پێغەمبەر ﷺ، قسەی نەکرد. پاشان عویمیر بە عاصمی گوت: پێغەمبەر ﷺ چی فەرموو؟ گوتی: پێغەمبەر ﷺ چونکە پرسیارەکەی پێ ناشیرن بوو هیچ وەڵامی نەداوە.. عویمیر گوتی: واللە واز لەم قسەیە نایەنم هەتا پرسیار لە پێغەمبەر نەکەم.. ئنجا عویمیر چووە لای پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاوێ: لەگەڵ ژنی خۆی پیاوێکی دیت زینای لەگەڵ دەکرد، ئایا ئەگەر خاوەن ژن زیناکەرەکە بکوژێ ئێوە بە تۆڵەو (قصاص) دەیکوژنەوە؟ یاخۆ هەرچی دەرحەقی دەکرێ بۆمان دیار بفەروون. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەرهەق بە تۆ و بە ژنی تۆ خودا قورئانی نارده خوارێ. ئنجا فەرمانی پێ‌کردن بە مولاعەنە-مولاعەنە بکەن-، لەپاش مولاعەنە عویمیر لای وابوو بە لعان تەڵاق ناکەوێ، بە صەراحەتیش ڕاست و ڕاست تەڵاقی دا لەپاش فەرمانی پێغەمبەر بە تەڵاق دانی.

(ش) لای ئیمامی شافیعی و سەحنون لە مالکیەکانە، لای ئەم دوانە بە لێبوونەوەی مێرد لە لیعان ژن و مێرد لێك جودا دەبنەوە، یەعنی جودابوونەوەیان دەبێ. لای ئیمامی

حەنەفی لێك جودابونەوە نابی بە فەرمانی حاكم واتە قازی نەبی، چونكی لای شافیعی جودابوونەوەی (فەسخ)ە، لای حەنەفیش جوودابوونەوەی تەلاقە، لای ئیمامی ئەحمەدیش ئەم دوو قسەیە گێردراوەتەوە.. گوتراویشە جودابونەوەی ژن و مێرد بە خستنی تەلاق لەلای مێرد نەبێ نابێ. فائیدەی(لعان) نەجاتی مێردە لە حەدی قەزف-واتە جوێن دان- نەجاتی ژنیشە لە حەددی (زنا).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێوە تەماشا بكەن، ئەگەر ئەم ژنە منداڵێكی بوو رەش بوو، گلێنكەی چاویشی زۆر رەش بوو، هەردوو لا سمتی گەورە بوو، دوو لولاقی ئەستور و گەورە بوو، گومان نابەم دەرهەق بە عوێمیر الا مەگەر قسەكەی راستە لەسەر زینای ژنەكە.. وە ئەگەر منداڵێكشی بوو سۆر بوو وەكو قومقموك پنك پنكی هەبوو، گومان نابەمە عوێمیر، ئیلا مەگەر ئیفترای بە ژنەكەیدا كردووە (یەعنی منالّەكە لە خۆیتی چونكە عوێمیر سوركە بوو).

پاشان ژنەكە منداڵێكی بوو، لەسەر ئەو صفەتی كە عوێمیر تەصدیق بكرێ، ئیتر منداڵەكە هەر نسبەت وەبال دایكی درا، نسبەت وەبال هیچ باوكێك نەدرا..

لەمە وا زاندرا كە پێك چوون(مشابهە) جێی باوەڕە(موعتەبەرە)، بەلاّم بەبێ حوكم پێكردن. ئەما ئەگەر نسبەت لە بەینی علایق بە مساوات(پەیوەندی بە یەكسانی) وەكوو دوو پیاو جماع بكەن لە طهرێك (پاك بوونەوەیەكی ژن) پێك چوون موعتەبەریشە حوكمی پێ دەكرێ، ئەگەر پێك چوونەكە لەلایەن پسپۆڕ بێ یەعنی لەلایەن (قایف) بێ (ئنجا لێك جودابوونەوەی هەتاهەتایە بە مولاعەنە بوو بە ئەمرێكی مەشروع، ئەگەر هیچ قەرینەی بەهێزتر نەبی بە تەشبیهی پسپۆڕ.

لەم حەدیسە شازدە حوكمی شەرعی وەرگیراوە، هەروەكو لە عەینی هەموویان مەوجودن لە جلدی(٩) لاپەڕە(٥٦).

## فەرمودەی خودا

﴿وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ﴾

١٠٨٣: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْبَيِّنَةَ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ؟ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ ﴿مِنَ الصَّادِقِينَ﴾، إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ، أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ.. فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ: لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە کوڕی عەباسﷺ گوتی: هیلالی کوڕی ئومەیەی واقفی ئەنصاری کە یەکێك بوو لەو سێ کەسانەی کە لە غەزای تەبووك پاش کەوتبوون وە تۆبەیان لیّ قبوولّ کرا، لە خزمەت پێغەمبەرﷺ نسبەتی زینای وەبالّ خەولەی کچی عاصمی ژنی خۆی دا، لەگەلّ شریکی کوڕی سەمحانەی حەبەشیە، کە باوکیشی نێوی عەبدە بوو کوڕی معتب.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: یاخۆ بە شاهێد قسەی خۆت بسەلمێنە و اسبات بکە، یاخۆ لەجیاتی ئەم جوێنە(قذف) بە حەددی شەرعی هەشتا دارت لە پشتی دەدرێ.. پاشان هیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکێك پیاوێك لەسەر ژنی خۆی ببینێ، ئایا دەچێ دەگەڕێ شاهێدان بدۆزێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ دووبارە فەرمووی وەزیفەت یاخۆ حەددە یا اسباتە.. هیلال گوتی: بە حەقی ئەو زاتەی کە تۆی بە پێغەمبەراتی ناردووە بە حەق من ڕاستم لە قسەی خۆم وە خودای گەورەش بێشك ئایەتێکی وا دەنێرێتە خوارێ کە تەبریەی پشتی من بکا لە داری حەد.. ئنجا جبریل هاتە خوارێ ئەم ئایەتەی بۆ سەر پێغەمبەرﷺ هێنا خوارێ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ هەتا ئایەتی ﴿إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾.. ئنجا پێغەمبەرﷺ هەناردیە شوێن هیلال و ژنەکەی. هیلال چوار شاهێدییەکانی لعانی ئەدا دەکرد، پێغەمبەریشﷺ دەیفەرموو: موحەقەق وە بەڕاستی خودا دەزانی یەکێکتان درۆ دەکەن، ئنجا ئەرێ هەرە یەکێکتان گەڕایەوە بێ بۆ لای خودای گەورە؟ پاشان ژنەکەی ڕاوەستا چوار جار شاهێدی دا کە مێردی من بەدرۆ نسبەتی زینای وەبالّ من دا، لا شاهێدی پێنجەم ڕایان گرت پێیان گوت: ئەم شاهێدی پێنجەم سەبەبی ئازارو عەزابی گەورەیە، ئەگەر تۆ درۆزن بی.. ژنەکە ڕاوەستا لە شاهێدی پێنجەم، هەتا وا تێگەیشتین گەڕاوەو پەشیمان بۆوە لە (لعان)، پاشان گوتی: ئابڕووی قەومی خۆم نابەم هەتا دونیا ماوە. شاهێدی پێنجەمیشی بەجێ گەیاند. پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تەماشا بکە ئەگەر منالێکی هێنا بێ کل چاوڕەش بوو، سمتەکانی گەورە بوو، لولاقەکانی ئەستور و گەورە بوون، ئەمە لە شریکی کوڕی سەمحانەیە. پاشان وەکوو منالەکە بوو ئەم صفەتانەشی تێدا بوو، ئنجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر حوکمی ئایەتی قورئان نەبوایە کە بە مولاعەنە واز دەهێندرێ، دەبوایە حەددێکی وا لەسەر ئەم ئافرەتە جێبەجێ بکەم بۆ هەموو ئەوانەی دەیان دیت و گوێیان لیّدەبوو ببایە پەند و عیبرەت.

(ش) شێخی شەرقاوی دەفەرموێ: (ممتنع نیيە) واتە لەوانەیە وابی-گوماندارکردنی شریکی کوڕی سەمحاء بە ئافرەتی هیلال و بەئافرەتی عومەیری عەجلانی لە حەدیسی پێش ئەمە ڕەت بوو، بۆیێ قورتبی گوتیتی ئەم ئایەتەی (لعان) دووجار هاتوەتە خارێ(یەعنی دەرحەق بە هەردوویان).

## سورەی ( فرقان )

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ﴾**

**١٠٨٤: عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ.**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ پیاوێك پرسی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چلۆن کافر لەدەشتی مەحشەر رۆژی قیامەت لەسەر ڕوویی خۆی دەڕوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو زاتی کە لە دونیا لەسەر دوو قاچی ڕۆیـاند، ئایا ناتوانێ کە لەسەر ڕووی بیڕوێنێ ڕۆژی قیامەت. یەعنی دەتوانێ چونکی ڕۆیاندن بە پەیداکردن و ئیجادی خودایە، قاچ لە کار لیکردن بێ موداخەلەیە ئەگەر نا کرم و مار و گیاندارانی بێ قاچ ئەبوایە پەکیان بکەوی. ئەم عەزابەشیان لەبەر ئەمەیە چونکی بە عاریان زانیوە سەر لە عارد دانێت لە دونیا بۆ خودا کڕنووش و سەجدە ببەن، ئنجا عەزابەکەیان دەگونجێ لەگەڵ کردەوەیان.

## سورەی ( قصص )

## سورەی ( سەجدە )

## فەرمودەی خودا

**﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾**

مەعنای ئایەت: یەعنی هیچ کەسێك نازانی لە ئەسبابی فەرەح و خۆشی بەدزی چ نیعمەتێکی سەیر بۆ ئەوان دانراوە(یەعنی نە مەلائکەی نزیك خراو نە پێغەمبەرەکانی ناردراو(مرسل) نازانن، لەفزی موصولەیە(نفس) نەکرەیەکە وا هەڵکەوتووە لە سیاقی نەفی بۆ عمومە، واتە هەرچەند بە نەفی ئەدا کراوە مەبەستی گشتییە.

**١٠٨٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ اللَّهُ عزَّوجلَّ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لا عَيْنٌ رَأَتْ وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ وَلا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ ذُخْرًا بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾.**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خدای گەورە فەرموویتی: سازمداوە بۆ بەندەکانی باشی خۆم لە ئەسبابی کەیف خۆشی و خۆشیەکان شتێکیوا کە نە هیچ چاوێك دیویەتی وە نە هیچ گوێچکێك بیستوویەتی وە نە بەسەر هیچ دڵێکدا تێپەڕیوە، وە بە زەخیرە بۆم داناون، ئێوە چلۆن ئاگادار دەبن لەسەر ئەو خۆشی‌یە هەڵگیراوانەی کە من بۆ بەندەکانی باشم داناوە. یەعنی دوورە ئێوە بزانن چونکی جێگای لەهیچ عەقڵێك نابێتەوە.. پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەشی خوێندەوە بە شاهیدی لەسەر فەرموودەی خۆی: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ...﴾.

(بَلْهَ) بە فەتحی با و سکونی لام و فەتحی ها بە مەعنا (دع وأترُكْ) اسم فعلە (بَلْهَ) فاعل حەقیقی بۆ اطلاع خودای گەورەیە، یەعنی واز بێنە کە ئێوە خەبەردار بکرێن بە تەفاصیلی خۆشی‌یەکانی بەهەشت لەلایەن خودای گەورەوە بۆ بەندە چاکەکانی، چونکە لە عەقڵێ ئێوە جێگای‌نابێ.. هاتویشە (بَلْهَ) بە مەعنا (کیف) بۆیێ مەعنامان بە چلۆن لێداوە.

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ﴾

١٠٨٦: عَنْ سَوْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ يَعْنِي الْبَرَازَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە(خوای لێ‌ڕازی بێ) گوتی: لەپاش هاتنەخوارەوەی ئایەتی (حجاب)، واتا خۆ داپۆشین، سەودەی کچی زەمعەی دایکی ئیمانداران لەپاش نوێژی عیشا بۆ پێشاو(قضا حاجەت) چووە دەرێ، حەزرەتی عومەر چاوی پێ کەوت، پێی گوت: ئەی سەودە بە حەقی خودا چونکی تۆ ژنێکی درێژ و بەلەش گەورەی، بزر نابی و دیاری، تەماشا بکە چلۆن دەچی‌یە دەرێ.. حەزرەتی سەودە گەڕاوە بۆ خزمەت پێغەمبەر چوو، پێغەمبەریشﷺ لە خانووی من زادی ئێوارەی دەخوارد، ئێسقانێکی بەگۆشتی بەدەستەو بوو. سەودە پێی گوت: من بۆ سەر پێشاو چوومە دەرێ، عومەریش ئەم قسانەی بەمن گوت، وە عائیشە گوتی: لەو کاتە وەحی بۆ هات، گۆشتەکەشی هەر بەدەستەوە بوو وەحی تەواو بوو، ڕووی لە سەودە کرد بەڕاستی کار و حاڵ وەهایە ئیزن دراوە بۆ ئێوە (یەعنی ژنە پاکەکانی پێغەمبەر) کە بچنە دەرێ بۆ بەجێ‌گەیاندنی حاجەت و پێویستی خۆتان.

(ش) لێرەدا لەم حەدیسە وا زاندرا مەبەست و موراد لە حجابی پێویست لە ئایەتی حجاب

داپۆشینی جەستەو پێستەیە بە جلك، نەك شاردنەوەی ئەشخاصە. بەم تەرزە لـە خـانوو نێنـە دەرێ، بەڵام حەزرەتی عومەر ﷺ وا تێگەیشتووە لەبەر ئیهتمامی بە دایکـەکانی ئیمـانداران داپۆشینی جەستەو شاردنەوەی ئەشخاص هەردوویان مەبەستن لـە ئایـەتی (حجـاب)، چونکـە رابورا لەباسی دەستنوێژ جارێکی تریش لـەپێش هاتنـەخوارەوەی ئایـەتی(حجـاب) حـەزرەتی عومەر حەزرەتی سەودەی لە دەرچوون قەدەغە کرد. بەڵام بەم حەدیسە بەدیارکەوت کە حجابی پێویست لە ئایەت تەنیا داپۆشینی جەستەو جەسەدی ئافرەتە.

هاتنەخوارەوەی ئایەتی حجاب یەکێکە لەو پازدە جێگایەی کـە رەئـی حـەزرەتی عومـەر لەگەڵ وەحی یەکدگیر بووە: شێخی شەرقاوی لەلاپەڕە(١٩٦) و لاپـەڕەی (١٩٧) بەباشـی لـە جلدی(٣) بەیانی هەر پازدەی فەرمووە، رازیبوونی خوداو مەرحەمەتی خودا لە ئێمەو لەویش بی.. آمین.

١٠٨٧: عَنِ عَائِشَةَ رَضِيِ اللَّهُ عَنهَا قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَمَا مَنَعَـكِ أَنْ تَأْذَنِي عَمُّكِ، ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائیشە(خوای لێ‌ڕازی بـێ) گوتـی: ئەفلـەحی بـرای ئەقوعەیسـی ئەشعەری بۆ لای من ئیزنی خواستەوە، منیش گوتم: ئیزن نادەم هەتا منیش ئیزن لە پێغەمبەر وەرنەگرم، چونکە ئایەتی حجاب(خۆداپۆشین) هاتبووە خوارێ، وە ئەفلـەحیش کـە بـرای ئـەبو قوعەیسە شیری بە من نەداوە بەڵکی ژنی ئەبو قوعەیس شیری بـەمن داوە و بـاوکی شـیریمی، ئینجا پێغەمبەر تەشریفی هاتە لام، منیش باسی ئیزن خواستنەوەی ئەفلەح و مەنعی خۆم بـۆ ئەو باس کرد هەتا پرسی ئەو ئیزن دانە بەتۆ نەکەم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆچی ئیزنت نەدا مامت بێتە لات؟ پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم پیاوە شیری بە مـن نـەداوە، بـەڵکی ژنی ئەبو قوعەیس شیری بە من داوە. فەرمووی: ئیزنی بدە چونکی ئەمە مامی شیری تۆیـە. دەستی راستت موحتاج بێ.

(ش): ئیتر عائشە لەپاش ئەمە دەیفەرموو: بە حەرام بزانن بە سەبەب شیر، هەرچی کە بە حەرامی دەزانن بەسەبەب نەسەب.

١٠٨٨: عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رَضِيِ اللَّهُ عَنهُ قَالَ رَسُولَ اللَّهِ: قُولُوا اللَّهُمَّ صَـلِّ عَلَـى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَـى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە کەعبی کوڕی عجرە، گوتی: وەکوو ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ﴾ هاتە خوارەوە، لەلایەن کەعب و بشری کوڕی سەعد پێ‌گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە دەزانین سەلام کردن لە تۆ، چونکی لە (التحيات) تۆ فێرت کردین، دەڵێین (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، خوداش بە (صلاة وسەلام) ئەمری بەئێمە فەرمووە، ئنجا صەلاوات چلۆن لێ‌بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: ئەی خودایا ڕەحمەت بڕێژە سەر محمد و ئەوانەی لەگەڵ محمدن، هەروەکو دات ڕژاندوتە سەر ئەتباعی ئیبراهیم بەڕاستی هەرتۆ ئەهلی سوپاس و ستایش و گەورەیی.

یەعنی ئەی خودایا لەلایەن تۆوە پێشتر ڕەحمەتت ڕژاندوتە سەر ئیبراهیم، ڕجات لێ‌دەکەین ڕەحمەتیش دابڕێژیە سەر محمد، چونکە ئەوی بۆ (فاضل) واتە پیاوی بەڕێز دێتەجێ بۆ (أفضل) واتە بۆ پیاوی بەڕێزتر باشتر دێتە جێ. بە (طريق الأولى) ڕەحمەت دابڕێژیە سەر محمد.

لە ڕیوایەتێکیش هاتووە ((كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ)) بۆیێ زاندراوە بۆ سەر محمد بە طريق الأولىیە.

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا﴾

یەعنی: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، وەکوو ئەولادەکانی یەعقوب مەبن کە بەقسەی نەوك و نالایق دڵی موسایان ئازار دا، ئنجا خودای گەورەش لە قسەکانی ئەوان موسای تەبریە کرد.

١٠٨٩: عَنْ أَبِي هريرةﷺ: إنَّ موسى كان رَجُلاً حيِيّاً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: موسى پیاوێکی بەشەرم و بەحەیا بوو.

حەدیسی پەیوەندی بەمە هەیە لە باسی غوسل ڕەت بوو.

## سورەتی (السبا)

## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾

١٠٩٠: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا صَبَاحَاهْ! فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ قَالُوا: مَا لَكَ؟ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ الْعَدُوَّ يُصَبِّحُكُمْ أَوْ يُمَسِّيكُمْ، أَمَا كُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس گوتی: ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ لە مەککە چووە سەر (صەفا) بە ئاوازێکی بەرز و بڵند فەرمووی: (یا صباحاه) کە کلمەیێکی وایە بۆ هاوارکردنە بۆ قەومێك دوژمن بەسەریدا دابێ لەکاتی بەیانی، وە بە کورتی دەگوترێ (هاوارە، هاوارە)، قورەیش لەسەری کۆبوونەوە، گوتیان: چیت لێ قەوماوە؟ بۆچی هاوار دەکەی؟ فەرمووی: ئێوە پێم بڵێن ئەگەر من خەبەرتان پێ بدەم دوژمن سبەینە یا ئێوارە بەسەرتان دادەدەن پێم باوەڕ دەکەن؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: دەنا من خەبەردەرم بەئێوە بە عەزابی سەختی ڕۆژی قیامەت:

(ش) ئەبولەهەب گوتی خەسارەمەندبی! هەر بۆ ئەمەیش ئێمەت کۆکردەوە؟! خودای گەورەش بە ڕەد لەسەر ئەبولەهەب سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ...الخ﴾ هەناردە خوارێ.

## سورەی زمر

## فەرمودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾

دەگێڕنەوەلە کوڕی عەباس گوتی: کۆمەڵێك لە کافران هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، وەحشیش یەکێك بوو لەوان، پێیان گوت: ئەم بانگ کردنەی تۆ بۆ ئایینی ئیسلام باشە ئەگەر خودا لە گوناهەکانی پێشوومان خۆش بێ ئەم ئایەتە هاتە خوارێ. ﴿قُلْ يَاعِبَادِي﴾ یەعنی: ئەی بەندەکانی من کە بە گوناهان زوڵمیان لەخۆیان کردووە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونکی خودا لەهەموو گوناهی گەورەو بچووك خۆش دەبی بە تۆبە یا بێ تۆبە.

## فەرمودەی خودا

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾

یەعنی: کافرەکان خودایان نەناسیوە بە ناسینێکی راست و لێوەشاوە بە گەورەیی خودا، وە هەر حەوت چینەکانی (طبقات)ی عارد لەژێر فەرمانی خودایە رۆژی قیامەت.

١٠٩١: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ وَيَطْوِي السَّمَوَاتِ بِيَمِينِهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ.

(تەرجەمە)

دەگێرنەوە لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ گوتی: بیستم لە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە رۆژی قیامەت بە تەوانایی خۆی ئەم عاردەی دونیا وەردەگرێتە لای خۆی وە ئاسمانانیش دەپێچێتەوە بە تەواوی خۆی، پاشان دەفەرموێ: منم پاشاو کاریلێکەر لە هەموو شتێك بە دروست کردن و لەناوبردن(ایجاد وافنا) لەکوێن پاشایەکانی عارد (ئایەت فەرموودەی خودا: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ﴾ فوو دەکرێتە ئەو شاخەی تایبەت بەرۆژی دوایی، جاری پێشوو لە فووکردنی یەکەم جارە، هەرچی لە ئاسمانان و عارد هەیە هەمووی دەمری (چەند مەلائیکەی نزیك خراو نەبن، پاشان ئەوانیش هەر دەمرن)، چونکە ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ واتە: هەرکەسێك مردن چێژە،

١٠٩٢: عَن أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ وَيَبْلَى كُلُّ شَيْءٍ مِنَ الإِنْسَانِ إِلاَّ عَجْبَ ذَنَبِهِ فِيهِ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ.

(تەرجەمە)

دەگێرنەوە لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەینی هەردوو فووەکانی صور چلە (ئنجا یا لە ساڵە، یا لە مانگ، یا لە رۆژ، لە حەدیث دیارنەکراوە) وە هەموو بەشێکیش لەجەستەی مرۆڤ دەرزی ئێسقانێك نەبێ. هەندەی دانە غەردالەیێك لە کلێنجە کە دواترینی ئێسقانەکانی پشتە بۆ لای خوارەوە لە بەینی هەدروو لا سمتی بە عەرەبی پێی دەگوترێ (عجب الذنب یا عجم الذنب) لەو ئێسقانە بچووکە لەپاش دووبارە پێك وە نانەوەی ئەندامەکانی پێشوو پێکەوە دەنرێتەوە (دەبێتەوە ئەو کەسەی کە لەکاتی مردن هەبوە.

## سورەتی (جاثیة)

## فەرموودەی خودای گەورە

## ﴿وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْرُ﴾

١٠٩٣: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ بِيَدِي الأَمْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە فەرموویتی: کوڕی ئادەم ئازارم دەدا، جنێو بە زەمانە دەدا (یەعنی وەکو تووشی ناخۆشی‌یەك بێ دەڵێ زەمانەیێکی ناخۆش و خراپە، حاڵیش وایە منم زەمانە، چونکی من پەیدام کردووە. کاروبار هەمووی لەخۆشی و ناخۆشی بەدەست منە، شەو دەکەمە ڕۆژ، ڕۆژ دەکەمە شەو(ئنجا وەکو جنێو بە زەمانە بدا گۆیا جنێوی بە من داوە، چونکی من پەیدام کردووە کە ببێتە شوێن و کات بۆ جێگای کاروبار و ڕووداو(حوادث).

(ش): ابن کثیر گوتیتی: ئەو کەسانەی گێڕاویانە لفظی (دهر) بەناوێکی خودا بە وەرگرتن لەم حەدیسە بەغەڵەت چووینە.

## فەرموودەی خودا

## ﴿وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾

١٠٩٤: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ فَأَخَذَتْ بِحَقْوِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ لَهُ: مَهْ! قَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: أَلا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ، قَالَ: فَذَاكِ.. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾، وَ في رواية عَنه قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ﴾.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە گەردوونی پەیدا کرد، پاشان وەکو لێبۆوە لە پەیداکردنی عالەم(یەعنی وەکوو حوکمی فەرموو بە تەواوبوونی، چونکی هیچ خەریك کەرێك خوا خەریك ناکا لەکارێك هەتا ایجاب بکا (واتا پێویست بێ) لەکارێك ببی. ئنجا دەست بەکارێکی تر بکا. بەڵکی لە یەك چاوکوتان تەوانایە سەدهەزار دوسەدهەزار کار بکا خزمایەتی و قەرابەت هەڵستا دامەنی کەلەکەی گەورەیی خودای

میهرەبانی گرت چونکە خودای گەورە فەرمووی: دامەنم بەردە، بۆچی دامەنم دەگـری؟ قەرابـەت گوتی: ئەم شـوێن و مەقامـە شـوێنی ئـەو کەسـەیە خـۆی بـەتۆ بپـارێزێ لـە عـەزابی بڕینـی خزمایەتی(واتا دەمەوێ ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتی دەبڕن خۆیشیان بەتۆ بپـارێزن تـۆ ڕجایـان قبوول نەکەی). خودای گەورە فەرمووی: ئەرێ تۆ ڕازی نابی هەرکەسێك پارێزگاری مافی تۆ بکا منیش پارێزگاری مافی ئەوی بکەم، وەە هەرکەسێکیش پارێزگاری مافی تۆ نەکا منیش لوتف و خۆشەویستی خۆمی لێ ببڕم؟ گوتی: با ئەی خودایا، خودای گەورە فەرمووی: ئەوا داواکاری تـۆم بەجێ گەیاند. پاشان ئەبوهورەیرە فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەن بخوێننەوە ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ...الخ.﴾ یەعنی لایقە ئەگەر کاروباری حکومەت بکەوێتە دەسـت ئێـوە خراپـە بکـەن لـە عـارد، مـافی خزمایەتی ببڕن.ئەی منافقەکان؟. لە ڕیوایەتێکی تریـش هـاتووە هـەر لـە ئـەبوهورەیرە گوتـی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بخوێننەوە ئەگەر حەزدەکەن ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ...الخ.﴾

## فەرموودەی خودای گەورە

## ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ﴾

١٠٩٥: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُلْقَى فِي النَّـارِ ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ﴾ حَتَّى يَضَعَ قَدَمَهُ فَتَقُولُ قَطْ قَطْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالكﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەهلی ئاگر دەخرێنـە ناو ئاگر، ئاگریش بەزمان دێ دەڵێ: من پڕ نەبوومـە جێگـام هەیـە، ئـەری قـەت لـەم زیـاد دەکەی، هەتا خودای گەورە قاچی خۆی لەنێو ئاگر دادەنێ (ئەمە کینایەتە لە مل کەچ کردنی ئاگر گۆیا ئاگرەکە زەلیل دەکا بەم تەرزە ئەیخاتە ژێر قاچی خۆی بە زەبوونی) ئەڵێ: بەس بەس پڕ بووم، جێگای کەسیترم تیا نابێ.

١٠٩٦: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَحَـاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: مَا لِي لا يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ؟ قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِـدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ فَلا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُـزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلا يَظْلِمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا.. وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَـلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: بەهەشـت و ئـاگر کێشـەیان بوو، بەزمانی حال یا بە زمانی مەقال، ئنجا ئاگر گوتی: من هەڵبژاردراووم بۆ ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانن و ئەوانە ستەم دەکەن.. بەهەشتیش گوتی: بۆچی زەبوونـەکان و بێهێزەکـانی بێنرخ لەپێش چاوی خەڵکی نەبێ نایێنە نێو من.. خودای گەورە بـە بەهەشـتی فـەرموو: تـۆ دیاردە(مظهر)ی مەرحەمەت و میـهرەبانی منـی (نـەك رەحمـەتی مـن، چونکـە میـهرەبانی صفەتێکی هەتاهەتاییە لەخودا جودا نابێتەوە)، بەتۆ مەرحەمەتی خۆم دەکەم بە هەرکەسێك حەز بکەم لە بەندەکانی خۆم.. بە ئاگریشی فەرمووە: بەڕاستی تۆ هەر عەزابی، بەتۆ عـەزاب دەدەم هەرکەسێك حەز بکەم لە بەندەکانی خۆم.. وە بۆ هەرکامێکیشیان لە هەردوویان شایانی ئەوەن کە پڕ بن. ئنجا ئاگر پڕ نابێ هەتا خودای گەورە قـاچی خـۆی لـەنێودادەنێ ئـەو کاتـە سێجار دەڵێ بەس بەس بەس، یەعنی پڕ بووم، ئنجا وەکو پڕبوو (لەبەر ئـەوەی زۆر هەوەسـی لێیە ستەمکاران بخوا)، ئاگر کۆدەبێتەوە سەر یەکتری و هـەندێکی دەچێتـە نێـو هـەندێکی. خوداش ستەم ناکا، بەم تەرزە چینە دروستکراوێك(مەخلوق) پەیدا بکـا و بـەبێ گونـاه بیـان خاتە نێو ئاگر(یەعنی بۆ دووزەخ هیچ کەسیتر دروست ناکرێ بەقاچی خۆی پڕی دەکا) بەڵام بۆ بەهەشت چینە دروستکراوێك پەیدا دەکا کە هیچ خێریشییان نەکردووە هەتا پڕ دەبێ.

(ش) چونکە عەزاب بۆ گوناهکارە، بەڵام پاداشت هەر نەوەستاوە لەسەر کاری باش..

## سورەتی (والنجم)

## فەرموودەی خودای گەورە

## ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللاَتَ وَالْعُزَّى﴾

١٠٩٧: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَـنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ وَاللاَّتِ وَالْعُزَّى، فَلْيَقُلْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك بە غـەیری خـودا سوێند بخوا وەکوو کافرەکان وادەکەن بڵێ سوێند بە لات و عـوزا، کـە دوو بـوت بـوون، لـەبۆ بەگەورەزانین، بەعەمدی کافر دەبێ.. ئنجا بۆ لابردنی کفرەکەی با بڵـێ: لا الـه الا الله، بـەڵام ئەگەر بە نەزانی یا بە لەبیرچوون وا بڵێ، پێویستە دیسان بۆ گەڕاندنەوەی مەبەستی خـۆی لـە سەهوو لەبیرچوون وە بۆ گێڕانەوەی زمان وەبال بەکارهێنانی کەلیمەیەك کە ئـەویش کەلیمـەی

خوا بەیەك زانینە، بلێ لا الە الاّ اللە. وە ئەگەر کەسێکیش بە رەفیقەکەی خۆی بلێ وەرە قومار بکەین، با خێرێك بکا هەتا ببێتە کەفارەی قسەکەی، چونکە هەر خێرێك دەبێتە کەفارە بۆ گوناە.

(ش): پێچواندنی قومار و بەراوردکردنی لەگەڵ سوێند بەلات و عوزا لەبەر ئەوەیە چونکی هەردویان کاری زەمانی پێش پەیدابوونی ئیسلامە.

## سورەی (الرحمن)

## فەرمموودەی خودای گەورە

﴿وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ، فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾

یەعنی: هەیە بێ لەدوو بەهەشتی باس کراو لە ئایەتی ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾ دوو بەهەشتی تریش غەیری دوو بەهەشتی پێشوو، نزیکتربوون لە عەرش بێ ئەوەی یەکێك لە یەکێك باشتر بێ، یەعنی بەبێ (تفضیل)، ئنجا بەکامی نیعمەتەکانی بەخێوکەری خۆتان نسبەتی درۆ دەدەن ئەی انسان و ئەجنە..

ریوایەتی کردووە حاکم لە جابر گوتی: پێغەمبەر ﷺ سوورەتی (الرحمن)ی خوێند بە تەواوی، پاشان فەرمووی: چلۆنە دەتان بینم قسە ناکەن، هیچ وەلاّمێك نادەنەوە، بەراستی (جن) لەئێوە باشترن دەربارەی وەلاّم دانەوە، ئەم خوێندووتەوە ئەم ئایەتی ﴿فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ هیچ جارێك ئیلا مەگەر گوتویانە (لا بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الْحَمْدُ) واتا ئەی خودای گەورە، هیچ لە یەك نیعمەتەکانی تۆ بەدرۆ نازانین، وە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە.

١٠٩٨: عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی قەیس کە ئەبوموسای ئەشعەرییە، گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەبەهەشت دوو باغی گەورە هەیە لە زیون قاپ و قاچاغیان و هەرچی لەنێویاندا هەیە هەموویان لە زیون، دوو باغی تریش هەیە لە زێڕن، قاپ و پێویستییەکان، هەرچی لەنێویاندا هەیە، هەموویان لە زێڕن... نیشتەجێ لە بەینی خەڵکانی بەهەشتەکان و تەماشای خودای بەخێوکەری خۆیان جیاکەرەوەیەك و فاصلێك پەردەی عەزەمەت و جەلال و گەورەیی

نەبێ لەسەر زاتی ئەقدەسی خۆی لە جنە العدن (یەعنی هەرکاتێك لەسەر شێوەی بەخشین و چاکەکردن بە ئیماندارانی تەواو، هاتنەخوارەوەکانی خودا بۆیان بێتە دی دیتنی خودا بەبێ پەیوەند و جیابوونەوە چۆنایەتی و چەندیەتی دێتەدی..

(ئەی خودایا لە زیان لێکەوتوانمان نەکەی، لە دیتنی خۆتمان بەش بدەی، لەگەڵ هەموو ئیمانداران، آمین.)

(ش): ئەم دوو بەهەشتەکانی لە زیو بۆ (اصحاب الیمین)ـە، دوو بەهەشتەکانی لە زێڕیش بۆ نزیك خراوەکانن لە خودا(مقربین)، بەڵام راست تر بۆ هەر لەخودا ترسێك ئەم چوار بەهەشتە هەیە، چونکی فەرموویەتی ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾، پاشانیش دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ یەعنی غەیری دوو بەهەشتی پێشوو چەند ئافرەتی چاو فرەوان و شیرین کە مێردەکانی خۆیان زۆر خۆش دەوێ لەنێو خێوەتان کە لە یەك پارچە دانە دوڕی کلۆر(مجوف) دروست کراون.

١٠٩٩: عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلاً فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُونَ ... وقد تقدم باقي الحديث آنفاً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی قەیسی کە نازناوی (کونیەی) ئەبو موسی‌ی ئەشعەری بووﷺ، گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی هەیە لەبەهەشت خێوەتی دروست کراو لە یەك دانە دوڕی کلۆر پانایی لە هەموو لایەك شەست میلە(هەر میلێکیش چوارهەزار شەقاوە)، لە قولینچکێك واتە گۆشەیەك خێزان و عائیلەیەکی هەیە لە حۆریان، هیچ کامێکیان ئەوانی تر نابینن لەبەر دووری ماوە(مسافە) وە مؤمن و باوەڕدارانی بەهەشت، هەرکەسێك دەگەڕێ لە خێزان و عائلەی خۆی، کە تایبەتە بە خۆشیەکانی ئەو.. ئەوەی کە ماوە لەپێش ئێرە باس کرا.

(ش): حەکیمی ترمذی گوتیتی لە تەفسیری (حور مقصورات فی الخیام) گێڕدراوەتەوە لە عەرشەوە هەورێك بارانی رەحمەت دەبارێنێ، لە هەر پشکێك لەم بارانە حۆریەك دروست دەبێ، پاشان لەسەر هەر حۆریەك خێوەتێك هەڵدەدرێ، لەسەر لێوی رووبارانی فرەوانی هەر خێوەتێك چل میلە. هیچ دەرگەشی نیە هەتا خۆشەویستی خودا(ولی) کە پیاوە بەهەشتیەکەیە دەچێ بۆ خێوەتەکە، ئنجا دەرگەیەك دەبێتەوە هەتا بزانێ چاوی هیچ دروستکراوێك لە ئینسان و ئەجنە و مەلائیکە بەم ئافرەتەو بەم جێگایە نەکەوتووە.. ﴿اللّهم ارزقنا بفضلك لا بعملنا﴾.

## سورەتی (الجمعة)
## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمْ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ، وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾

تەفسیری ئەم ئایەتە بە کوردی، خودای گەورە زاتێکە محمدی هەنارد بە ڕابەر و مورشیدی دین و دونیا لە قەومی نەزان و جاهلی زەمانی خۆی بۆ ڕێ نیشاندانیان وە بۆ قەومی نەزانی پاش زەمانی خۆی لە غەیری عەرەب کە عەجەمن یا لە هەموو قەومێك.

(تەفسیری نەسەفی)

١١٠١: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ كَانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ أَوْ رَجُلٌ مِنْ هَؤُلاءِ، وَضَعَ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ ثُمَّ قَالَه: وآخرين...الخ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: ئێمە دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەرﷺ سورەتی (الجمعة)ی بۆ هاتە خوارێ وەکو خوێندییەوە ﴿وَآخَرِينَ...الخ﴾، پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! لە (اخرين) کێن؟ پێغەمبەرﷺ وەڵامی نەداوە هەتا سێ جار لێی پرسیار کرد، سەلمانی فارسیش لە مەجلیس بوو، دەستی پیرۆزی لەسەر سەلمان دانا، پاشان فەرمووی: ئەگەر ئیمان لەلای کۆمەڵە ئەستێرەی پێروو بێ دەیگەنێ چەند پیاوێك لە قەومی ئەم زاتە کە ئەهلی فارسن.

(ش): قورتبی گوتیتی: ئەم حەدیسە پیرۆزە یەکێکە لە ئەدیلەی(بەڵگەکانی) ڕاستی پێغەمبەرﷺ، چونکە بەتەواوی هاتەجێ کە چەند پیاوی گەورە گەورە وەکو ئەبوحەنیفەو محمدی غەزالی و ئەبایەزیدی بەسطامی و غەیری ئەمانەیش لەخاکی فارس بووینە، بۆیێ جەلالەدینی دەوانی بە فارسی گوتیتی:

شمس علم أز أفقي چرخي عرب شد طالع
استوا يافت ولى در وسطى ملكى عجم
يافت در روم زوال از اثرى كثرتي عرف
جزم بي نور و ضيا ماند درين داري اَلَمْ
آمن أنروز يكسر بنهدسر بغروب
ظلمتي جهل بگيرد همەرويى عالم

## سورەتی (المنافقين)

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِذَا جَاءَ كَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾

١١٠٢: عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: قال: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيْدُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە زەیدی کوڕی ئەرقەم‌ﷺ گوتی: لە غەزای تەبوك گوێم لێبوو عبداللە ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی منافق دەیگوت: هیچ چاکەیەك بە موهاجرەکانی ئەصحاب مەکەن، بەڵکی بڵاوە دەکەن لە دەورەی پێغەمبەرﷺ، وە ئەگەر لەم غەزایە بیشگەڕێینەوە مەدینە، بێ‌شك گەورەو لێوەشاوەکان زەلیلەکان دەردەکەن لە مەدینە، مەبەست و مەقصوودی ئەمەبوو منافقەکان ئەصحابی مهاجر(کۆچ کردوو) دەردەکەن، منیش قسەی عبداللە منافقم بۆ مامم سەعدی کوڕی عبادە گێڕاوە، حەزرەتی عومەریش قسەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕاوە، ئنجا بانگی منی کرد، منیش قسەکانم بۆ بەڕێزی گێڕایەوە، پێغەمبەریش ناردیە شوێن عبداللە ی کوڕی ئوبەی و هەواڵەکانی، سوێندیان خوارد ئەم قسەیان نەکردووە، پێغەمبەر قسەکانی ئەوانی بەڕاست زانی و قسەکەی منیشی بەدرۆ زانی، زۆر غەمناك بووم، بەرادەیەکی وا قەت تووشی غەمی وا گەورە نەهاتووم، لەخانووی خۆم بە کز و پەرێشانی و دڵتەنگی دانیشتم.. لەسەر ئەم غەمناکی‌یەی خۆم مامیشم سەرزەنشتی دەکردم پێی گوتم: هەر ئەمەندەت دەویست کە پێغەمبەرﷺ قسەی تۆ بەدرۆ بزانێ. (یەعنی ئاخر لەخۆت نەگەڕای هەتا قسەشت بەدرۆ زاندرا).

ئنجا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ فەرمووی: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ...﴾، ئنجا پێغەمبەرﷺ ئایەتی بۆ خوێندمەوە فەرمووی بەڕاستی خودای گەورە ڕاستی قسەکانی تووی بەدیار خست ئەی زەید.. پاشان پێغەمبەرﷺ ناردیە شوێن عبداللە و هەواڵەکانی منافق کە داوای لێبووردنیان بۆ بکا، سەریان هەژاند و ڕوویان لە قسەکانی پێغەمبەر وەرگێڕا و نەهاتن. حەزرەتی عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا لێم گەڕی بیکوژم، فەرمووی: نابێ، تەبادا بڵاوبێتەوە بڵێن محمد ئەصحاب و یارانی خۆی دەکوژێ.

١١٠٣: عن زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ وَأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمﷺ گوتی: گوێم لـە پێغەمبـەرﷺ بـوو دەیفـەرموو بـە دوعاو پاڕانەوە: ئەی خودایە لە ئەنصار خۆشـبە کـە خـەڵکی مەدینـەن، وە لـە منداڵـەکانی ئەنصار خۆشبە، واتا کوڕ و کچەکانیان، وە لە منداڵی منداڵی ئەنصار خۆشبە.

## سورەتی (تەحریم)

## فەرموودەی خودای گەورە

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ﴾

١١٠٤: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ: لا وَلَكِنِّي أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْـدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَلَنْ أَعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لا تُخْبِرِي بِذَلِكَ أَحَدًا، قاله لما قالت: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ إِنِّي أَجِدُ مَعَكَ رِيحَ مَغَافِيرَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لـە حـەزرەتی عائیشـەﷺ گوتـی: پێغەمبـەرﷺ هـەنگوینی دەخـواردەوە لای زەینەبی کچی جحش، دەوامیشی دەکرد لە دانیشتنی لای ئەو، من و حەفصەش موافەقـەتمان کرد کە پێغەمبەرﷺ بێتە لای هەر کامێکمان پێی بڵێین: مـەغافیرت خـواردووە؟ (مـەغافیر جەمعە بۆ موغفور لە داری عرفط پەیدا دەبی، شیرینە بەڵام بۆنی ناخۆشە)، بێنی مەغافیرت لێ دێ. پێغەمبەریشﷺ هاتە لای هەر یەکێکمان، قسەکەی وەکو پێ‌گوترا، فـەرمووی: نـا، بەڵام هەنگوێن لای زەینەبی کچی جـەحش دەخۆمـەوە، کەوایـە جـارێکی‌تر بـۆ خواردنـەوەی ناگەڕێمەوەو بەڕاستی سوێندیشم خوارد لەسەر نەخواردنەوەی هەنگوێن، تۆیش قسە لای هیـچ کەسێك نەکەی.

(ش) غیرەت نواندنی عائیشە لەسەر زەینەب چونکە عائشە سەرۆکی کۆمـەڵێك بـوو لـە خێزانەکانی پێغەمبەر، زەینەبیش سەرۆکی کۆمەڵێکی تر بوو، وەکوو لە باسی هبە بە درێـژی باس کرا، بەڵام لە کتێبەکانی تەفسیر وەکو صاوی و حەواشـی جەلالـەین و غـەیری ئـەوانیش سەبەبی هاتنەخوارەوەی سوورەی تەحریمیان گێڕاوە بـە نـاڕەزایی دەربڕینـی عائشـەو حەفصـە چونکە پێغەمبەرﷺ لە نۆبەتی حەفصە چووبوە لای ماریە. ئنجا لەوانەیە ئەسباب(هۆیەکانی) ناڕەزایی‌یان زۆر بێ، چونکی بۆ نـاڕەزایی دەربڕینـی ئافرەتـان دەرحـەق بـە پیـاوان ئەسـباب بێ‌ژمارە.

## سورەتی ( النون )

## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾

١١٠٥: عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعَّفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ، أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حارثەی کوڕی وەهبی خوزاعی‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئاگادار بن خەبەرتان پێ دەدەم بە ئەهلی بەهەشت، هەرکەسێکی بێ‌هێزی زەبوونی ڕێزلێ‌نەگیراوە لەلایەن خەڵك، ئەگەر لەبەر ئەوەی بگاتە چاکەیەك لای خودا سوێندێك بخوا کە خودا ئەم چاکەی‌پێ ببەخشێ خودا چاکەکەی لەگەڵ دەکا سوێندەکەی ناخا.

ئاگادار بن، خەبەرتان پێ‌دەدەم بە ئەهلی ئاگر، هەر ڕووگرژ و دڵ ڕەق و ناحەزێکە، قەڵەو و بەدەعیەیە لە ڕۆیشتن، خۆ بەگەورەزانە لەهەمو ئەحوالی خۆی.

الجواظ: الكثير اللحم المختال في المشي.

١١٠٦: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَكْشِفُ رَبُّنَا عَنْ سَاقِهِ، فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ، وَيَبْقَى كُلُّ مَنْ كَانَ يَسْجُدُ فِي الدُّنْيَا رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ لِيَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعید‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە خۆی لە حساب و جەزای عالەم هەڵ دەکا (وەکو فەرموویەتی: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَا الثَّقَلَانِ﴾) ئنجا سەجدەی بۆ دەبەن پیاوو ژن لە ئەهلی ئیمان. دەمێنێ ئەو کەسەی سەجدەی بە (ریاء) بۆ بردووە لە دونیا هەتا بە پیاوی باش بناسرێ لەناو خەڵکی. ئەویش دەچێ سەجدە ببا پشتەکەی یەك تەختە ڕەق دەبێ. پێی ناکرێ دابێتەوە سەجدە ببا (أعاذنا الله من الرياء) واتا خوا بمان پارێزێ لە خواپەرستی بەڕیا و ساختە.

## سورەتی ( النازعات )

## فەرموودەی خودای گەورە

﴿أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾(أي الساعة)

١١٠٧: عن سَهْلُ ابْنُ سَعْدٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بُعِثْتُ وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ، قَالَ بِإِصْبَعَيْهِ هَكَذَا بِالْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی‌ﷺ لە مەقامی تەفسیری ﴿أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾: گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من ناردراوم بە پێغەمبەرایەتی من و قیامەت وەکوو ئەم دوو ئەنگوستەمە. بە ئەنگەستی شەهادەو ناوەند نیشارەی فەرموو (یەعنی دەربارەی نەهاتنی هیچ پێغەمبەرێکی‌تر لە بەینی من و قیامەت کە ببێتە جوداکەرەوە بەراوردو موقارەنەمان وەکو بەراووری ئەم دوو ئەنگوستانەیە، بەڵام خودا نەبێ کەسیش نازانێ کەی دێ).

## سورەتی ( عبس )

## فەرموودەی خودای گەورە

﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ﴾

١١٠٨: عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ حَافِظٌ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ فَلَهُ أَجْرَانِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائیشە خوا لیٚی رازی بێ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وێنەو صفەتی ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەخوێنێ و زۆر شارەزایە لە خوێندنی قورئان، وەکو مەلائیکەی پیرۆزن لە نووسینەوەی نوسخان لە لەوح و لەبەر وە هاتنیان بۆ لای خەڵکی بۆ تەبلیغ و گەیاندنی ئەحکامەکانی خودایی، لە هیچ کامێکیان ئەزیەت و ناخۆشی نییە. وە وێنەو میسالی ئەو کەسەی قورئانی ڕەوان نییەو بە زەحمەت دەخوێنێ، ئەگەرچی ناگەنە مەرتەبەو پایەی ئەوانەی ماهرو شارەزان لە خوێندنی قورئان، بەڵام بۆ ئەوانیش دوو پاداشت هەیە: یەکێك پاداشتی تیلاوەت و خوێندنی قورئان، دووەم پاداشتی ئەزیەت دیتنەکە.

## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

یەعنی ئەو ڕۆژەی خەڵك هەڵدەستن لەنێو قەبران دێنە دەرێ بۆ ئەمری بەخێوکەری مەخلوقات و حساب و جەزا.

١١٠٩: عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ) حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عومەرﷺ گوتی: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: عالەم هەڵدەستنەوە لە قەبران بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانی خودا لە حساب و جەزایان-جیرم و خودی خۆریش یان هەندەی ماوەی میلێك لێ بەنزیك دەکەوێ، گەرمایی بیست ساڵیشی پێ دەدرێتەوە-هەتا هەیە یەکێك لەوان بزر دەبێ لەنێو تکەی ئارەقەی خۆی هەتا ناوەندی گوێیان.

(ش): قازی ئەبوبەکری ابن العربی گوتیتی: هەرکەسێك ئارەقەی خۆی لەخۆی جودا نابێتەوە کە غەیری خۆی پێ گرفتار ببێ، لەسەر پێچەوانەی عادەتی دونیایە چونکی ئەگەر جەماعەتێك و کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر عاردێکی ڕاست ڕابوەستن، ئاو هەموویان وەك یەك دەگرێتەوە بەبێ تەفاوت، بەڵام لە قیامەت شەخصێك لەنێو ئارەقەی خۆی نزیکە بخنکێ، جیرانی تەنیشت خۆشی ئاگای لەهیچ نییە، ئەمە لەم تواناو قودرەتە گەورەیە کە لەسەر عادەتی دونیا نیە پێویستە باوەڕ و ئیمانی پێ بینی.

## سورەتی ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾

## واتە سورەتی (انشقاق)

## فەرموودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾

١١١٠: عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ إِلاَّ هَلَكَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە خوای لێڕازیبێ، گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ

کەسێك نی‌یە حسابی لەگەڵ بکرێ، ئیلا مەگەر بەهیلاك چووە.. ئنجـا ئـەوەی کـەماوە لـە حەدیسە لە کتابی علم ڕەت بوو.

بەم تەرزە حەزرەتی عائشە پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەدی خودا نەی فەرمووە ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا، وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْــرُورًا﴾؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ ئەوانی دەسـتەڕاسـتن (ئەهلی یـمین) حسـاب نی‌یـە پـێ‌بزانی چـاکەی چەندەو خراپـەی چـەندە. پاشـان خـودای گـەورە پاداشـتی خواپەرسـتی‌یەکانی پـێ‌دەداو لـە گوناهەکانیشی خۆش دەبێ و نەجاتی دەبی لە عەزاب، وە دەچێتە بەهەشت..

(اللهم أرزقنا باحسانك) خودایە بەچاکەی خۆت لەگەڵمان بکەی.

## تەفسیری سورەتی (الشمس)
## فەرموودەی خودای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾**

١١١١: عَنْ عَبْدُاللّهِ ابْنُ زَمْعَةَ، قَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ: ( إِذِ انبَعَـثَ أَشْقَاهَا ) رَجُلٌ عَزِيزٌ عَارِمٌ مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ.. وَذَكَرَ النِّسَاءَ فَقَالَ: يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ فَيَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، فَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ.. ثُمَّ وَعَظَهُمْ فِي ضَحِكِــهِمْ مِــنَ الضَّرْطَةِ وَقَالَ: لِمَ يَضْحَكُ أَحَدُكُمْ مِمَّا يَفْعَلُ؟! مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ عَمِّ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی زەمعە: دایکی نێوی قورەینە بوو، خوشکی ئومی سەلەمەی دایکی ئیمانداران بوو، گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ لـە ئـەنواعی ئامۆژگاریـەك خوتبـەی دەخوێند، یەکەم باسی ووشتری صـالح پێغەمبـەر و کـوژەری ووشـترەکەی کـرد، بـەم تـەرزە فەرمووی ﴿إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾ یەعنی وەکوو چـوو بـەدڕەفتارترینی هۆزەکـەیان بـۆ کوشـتنی ووشترەکە پیاوێکی بە عیزەت و سەخت بوو. جەبار و ڕەقەکار بوو، گێرەشێوێن و پیـس بـوو، بەهێز و مەحکەم بوو لەنێو قەومی خۆی، دەربارەی هێز و گەورەیی لەنێو قەومی خۆی وەکـو ئەبوزەمعە بوو(کە بەکافری مرد لە مەککە).

پاشان دەربارەی ئافرەتانیش هـەندێ ئامۆژگـاری کـرد بـەو تـەرزە فـەرمووی: یـەکێکتان دەیەوێ لەپاش ڕق بوونەوە لە ژنەکەی خۆی، لێی دەدا وەکوو لێدانـی گـەورە لـە کۆیلەکـەی خۆی، پاشان هەر لە ئاخری هەمان ڕۆژ لەگەڵی درێژ دەبێ و لەگەڵی جووت دەبی (یـەعنی وا مەکەن، چونکە بە شتی وا ڕك لێبوونەوەو لێك دوورکەوتنەوە پەیدا دەبێ).

لەپاشان دەربارەی پێکەنین بە ترکەندن ئامۆژگاری کرد فەرمووی: بۆچی یەکێکتان پێدەکەنی بەکەسێکی بایێکی بێئیختیاری خۆی لێ ڕوو دەدا..

لەگێڕانەوەیەکیتر فەرمووی: کوژەرەکەی ووشتری صالح کە قەداری کوڕی سالف بوو وەکوو ئەبو زەمعەی مامی زوبەیری کوڕی عەووام وابوو.

## سورەتی (إقرأ)
## یان سورەتی (قلم)
## باسی سەرەتای دەست پێکردنی وەحی(سروش)

لە حەزرەتی عائیشە دەگێڕنەوە بە تەواوی لەبەشی پێشوو لە کتابی علم ڕەت بوو، لێرە لەبەر دووبارەکردنەوە نەمان نووسی.

## فەرمودەی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾

یەعنی: ئەگەر ئەبوجەهل تۆبە نەکا لە ئەزیەت دانی پێغەمبەرﷺ، بەگەورەیی خۆم، واتە سوێند بە گەورەیی خۆم، ناوچەوانی دەگرم.

١١١٢: عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَوْ فَعَلَهُ لأَخَذَتْهُ الْمَلائِكَةُ، قالَ حينَ قَالَ أَبو جَهْلٍ: لَئِنْ رَأَيْتُ مُحَمَّدًا يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ لأَطَأَنَّ عَلَى عُنُقِهِ فَبَلَغَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فقالهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی حەزرەتی عەباس ﷺ گوتی: ئەبوجەهل گوتی: ئەگەر محمدم بدیتایە نوێژ دەکا لای کەعبە، بەقاچی خۆم پێم لە ملی دەنا.. پاشان ئەم قسە گەیشتە پێغەمبەرﷺ، فەرمووی: ئەگەر ئەمەی بکردایە گرفتاری چەنگی مەلائکە دەبوو.

## سورەتی (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ)
## یان سورەتی (کَوثَر)

١١١٣: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حَافَتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفٌ فَقُلْتُ مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ قَالَ هَذَا الْكَوْثَرُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەس ﷺ گوتی: وەکوو پێغەمبەرﷺ سەرخرا بۆ ئاسمان، فەرمووی: هاتنە

سەر ڕووبارێك لەهەردوولای ڕووبارەکە چەند گونبەتی یاقوتی سپی کلۆر هەبوو، منیش بە جبریلم گوت: ئەمە چی‌یە؟ گوتی: ئەمە ئەو کەوسەرەیە کە خودای تۆ بە تۆی داوە.. پاشان جبریل دەستی درێژکردە ئێوی لەمسکی پوختی کەسکوون هەندێ قوڕی هێنا دەرێ.

١١١٤: عَنْ أُبَيِّ بْنَ كَعْبٍ قِيلَ لِي فَقُلْتُ، قَالَه لَمّا سُئِلَ عَنِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئوبەی کوڕی کەعب گوتی: بە پێغەمبەری گەورەم گوتﷺ: ئەرێ هەردوو (قل أعوذ) قورئان نین؟ فەرمووی: ئەم سوورەتە لەلایەن خوداوە بەزمانی جبریل بەمن گوتراوە. چلۆنیش بەمن گوتراوە، منیش وایان دەخوێنم.. ئوبەی گوتی: کەوایە ئێمەش وەکوو پێغەمبەرﷺ دەیان خوێنین.

(ش): لەم حەدیسە پیرۆزە بەدیار کەوت عبداللە ی کوڕی مەسعودﷺ کە (معوذتین)ی نەگێڕاوە بە قورئان بەلکی لە قورئانێك بیدیتبایە ڕەشی دەکردەوە، باطلە، واتا ئەم کارە تەواو نی‌یە.

چونکە ئیمامی نەوەویش بە استناد وەسەر ریوایەتی راست لە کتێبە ناودارەکانی حەدیس لە شەرحی مەهەذەب گوتیتی. لەسەر ڕای هەموو ئومەتی ئیسلام (معوذتین) و (فاتحة) لە قورئانن وە هەرکەسێك ئینکاری ئەم قسەیە بکا کافر دەبێ.

قازی ئەبوبەکری باقلانی بۆ ئیبنی مەسعود وای لێك داوەتەوە: ئیبنی مەسعود انکاری بوونی ئەم دوو سورەتە(قل أعوذ برب الناس) لەگەڵ (قل أعوذ برب الفلق) کە قورئانن ئینکاری ئەمەی نەکردووە، بەلکو نەیویستووە لەقورئان بنوسرێن، چونکی دەی دیت هەر وەحیەك هاتبایە خوارێ، هەتا پێغەمبەر فەرمانی بە نووسینی نەکردبایە نەیادەنووسی. ئینجا لەوانەیە ئاگای لەم فەرمانەی پێغەمبەر نەبووبێ بۆیێ لە قورئان ڕەشی دەکردنەوە. پاشان لەوانەشە نزیکە لەبەرئەوەی هەموو ئەصحاب لەسەر چەسپاندنیان کە ئەم دوو سورەتە قورئانن لەقسەی خۆی پەشیمان بوبێتەوە.

خولاصەی کەلام واتە بەکورتی، ئەگەرچی اختلافێك و نەگەیشتنە یەکتریەك لەم بارەیە ڕووی‌دا بەلاّم ئەمە نەما وە ئینکاری بوونی ئەم دوو سورەتە کە قورئان نەبی ئەمەیان کفرە بەلکو ئەم دوو سورەتە قورئانن.

## باسی گەورەیی

## ( قورئان )

**١١١٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْيٌ أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ.**

**(تەرجەمە)**

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ پێغەمبەرێك نی یە لە پێغەمبەران ئیلا مەگەر پێی دراوە کە خەڵکی نەتوانن شتێکی وەکو ئەو بکەن، وە هەریەك بەگوێرەی زەمانی خۆی، کە بەناچاری هەرکەس لەو زەمانەدا باوەڕی پێ دەهێنا بەدیتنی موعجیزەکە(واتا هەر پێغەمبەرێك بۆ ئەوەی داواکەی خۆی بسەلمێنێ کە تایبەت بەو کارەی کە لەزەمانی خۆی باوە وەکوو بوونە دار عەسا بە حەزیا، چونکی بەزۆری لەزەمانی موسی جادوو سیحر هەبووە، ئینجا موعجیزەیەکی پێدان موافقی سیحر بێ، ئینجا ناچاری کردن باوەڕی پێ بێنن، بەزۆری لەزەمانی عیسی سەلامی خوای لێبێ پزیشکاتی وە طەبابەت بووە، ئنجا موعجیزەیەکی وا هات باڵاتر بوو لەو طوبەی کە ئەوان شانازیان پێوە دەکرد لەنێوان باوو مەرغوب بوو وەکو زیندووکردنەوەی مردوان. بەزۆری لە زەمانی پێغەمبەری گەورەمان محمدﷺ بەلاغەت و ڕەوانی بوو لە قسەدا کە عەرەبەکان لە بەینی خۆیان شانازیان پێوە دەکرد، ئنجا بۆ داوای پەیام و رسالەتی خۆی بەقورئانی پیرۆز هاتە مەیدان، کە هەموو ئەوانەی کە زانابوون لە بەلاغەت بەرامبەری دەستەوەستان ڕاوەستان بەرامبەر ئەم قورئانەو هەموویان نەیان توانی ئایەتێکی وەکوو ئەم قورئانە بێننەوە، بۆیێ فەرمووی: بەڕاستی ئەو موعجیزەی بەمن دراوە کە قورئانە وەحییێکە کە ئەویش قورئانە، خودا بۆی ناردوومە، ئینجا ئومێدیش دەکەن من لەوان زۆرتر بم بە ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ من دەبن رۆژی قیامەت )یەعنی ئومەتی من لەهەموویان زۆرتر بێ چونکی بە دەوام و هەمووکات ئەم قورئانە شتێکی وایە کەس ناتوانێ شتێکی وەکوو ئەو دابهێنێ واتە موعجیزە باوەڕی نوو دەبێتەوە لەنێو خەڵکی هەموو زەمانێك، خۆ موعجیزاتی قورئانیش نابڕێتەوە، بێجگە لە بەلاغەتی تەماشای ئاگادارکردنەوەکانی بکە بە شتی نادیار (أخبار الغيب) لە هەر چاخێك تەئویل و مەعنای چەند ئایەتی بەدیار دەکەوێ، لە کاروباری وا کە هیچ کەسێك بە دڵیدا تێنەپەڕیوە، کەچی هەزار و سێسەد و حەفتا و ئەمەندە ساڵەیە لەپێش ڕوودانی خەبەری پێداوە. خەڵکی هەرچاخێکیش پاشی ڕوودانی تێدەگا وە دەڵێ: لەمێژە قورئانی پیرۆز خەبەری بەم ڕووداوانە داوە، ئێمە نەمان دەزانی.

هەروەکوو هاتووە لەسیرەی حەلەبی لە جوزئی یەکەم، لەلاپەڕەی (٣٠٦) بە خەبەردان لە تەلەفۆن و ڕادیو لە نزیکی قیامەت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُكَلِّمَ الرَّجُلَ شِرَاكُ نَعْلِهِ وَعَذَبَةُ سَوْطِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا فَعَلَهُ أَهْلُهُ))[1].

لێرەدا مەبەست ئەو دارەیە کە دەنگی پێ بڵند دەکرێ لە ڕادیۆ.

(شراك نعل): بەو قەیتانە دەڵێن کە قۆندەرەی پێ قەیم دەکرێ، بەڵام لێرە مەبەست ئەو دارەیە کە لە تەلەفۆن بە میکرۆفون و سەماعەوەیە..

دە ئنجا هەتا لەم تەئریخە(١٣٧٢) ئەگەر بەچاوی خۆمان تەلەفۆن و ڕادیۆمان نەدیتبولیە، چلۆن ڕاستی مەعنای ئەم حەدیسە پیرۆزەمان لێ بەدیاردەکەوت، کە تەنیا بە اعتباری مەعنا لە وەحی حساب دەکرێ نەك بە لەفظیش.

١١١٦: عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّاب رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ لِي: أَرْسِلْهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: اقْرَأْ، فَقَرَأَ، قَالَ: كَذَلِكَ أُنزِلَتْ، ثُمَّ قَالَ لِي اقْرَأْ يا عُمَر، فَقَرَأْتُ فَقَالَ: كَذَلِكَ أُنزِلَتْ، إِنَّ الْقُرْآنَ أُنزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عومەرﷺ گوتی: بیستم هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حزامی ئەسەدیﷺ لە سوورەی فورقانی دەخوێند، لەوکاتەی کە پێغەمبەرﷺ لە ژیاندا بوو، گوێم دایێ بەچەند حروفێکی وای دەخوێند، بەو حرفانە پێغەمبەرﷺ بەئێمەی نەدەخوێند. منیش ئەمەندەم ڕق بۆوە نزیك بوو سواری سەرکی بم، پاشان بەهەر حالێك بوو خۆم ڕاگرت هەتا سەلامی نوێژی داوە، پاشان بەتوندی لەسەر ئەو دوو گردەی کە لەسەر بوو کۆم کردەوە، ئەوەك لەبەردەستم ڕابکا گرتم، گوتم: کێ ئەم سوورەتەی وا بەتۆ گوتووە؟ گوتی: پێغەمبەرﷺ، گوتم: درۆدەکەی، پێغەمبەر بەم جۆرە خوێندنەوەی بەمن نەگوتووە. ئنجا بەڕاکێشان بردم هەتا خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێم گوت: ئەمە قورئان دەخوێنێ لەسەر غەیری ئەم حروفانە کە تۆ بە منت خوێندوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەریدە، ئەی هیشام بخوێنە، وەکو خوێندی و پێغەمبەریش گوێی دایێ فەرمووی: بەم تەرزە هاتووتە خوارێ، پاشان فەرمووی: ئەی عومەر تۆیش بخوێنە، عومەریش گوتی: خوێندم، بەم جۆرە خوێندنەی پێغەمبەرﷺ بەمنی گوتووبوو، فەرمووی: بەم تەرزە هاتۆتە خوارێ، چونکە بەڕاستی ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە هاتۆتە خوارێ، ئنجا بیخوێنن بەهەرشێوەیەکی کە باشی دەزانن و بۆتان ئاسانە لەم هەر حەوت

[1] عەذەبە: بەو دارە بەنە دەڵێن کە تەرازووی پێ بلند دەکرێ.

شێوەیە..

ئەم حەدیسە لە باسی خصومەت ڕەت بوو لەوێ فەرمووی (كلاكمـــا محســـن) لەلاپـەڕە (٣٩) لە بەرگی یەکەم حەدیسی ژمارە (٦٣٣).

١١١٨: عَنْ فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلام: أَسَرَّ إِلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُنِي بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ مَرَّةً، وَإِنَّهُ عَارَضَنِي الْعَامَ مَرَّتَيْنِ وَلا أُرَاهُ إِلاَّ حَضَرَ أَجَلِي.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی فاطمة (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرﷺ بەدزی بە منی گوت: بەڕاستی جبریل هەموو ساڵێك لە ڕەمەزاندا دەهات جارێك قورئانی لەگەڵ من دەخوێند، ئیمساڵ دووجاری پێ خوێندم، گومان نابەم ئیلا مەگەر مردنم نزیك بووە.

(ش): مەعنای موعارەزە لە حەدیس، موعارەزە موفاعەلەیە لە دوو لا، یەعنی جارێك جبریل دەی خوێند پێغەمبەرﷺ گوێی دەدایێ، جارێکیش پێغەمبەرﷺ دەیخوێند جبریل گوێی دەدایێ. ئەمەیش لەمانگی ڕەمەزان هەموو شەوێك دەهاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ هەتا ڕەمەزان تەواو دەبوو، لەپێش کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە و لەپاش کۆچ کردن، یەعنی بەبێ بەستنەوە بەپاش کۆچ کردن، چونکە لەپێش کۆچ کردن ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز نەکرابوو، مەبەستیش لە قورئان ئەو میقداری کە نازل کرابوو، چونکی تا ڕەمەزانی ئاخیر لەژیانی پێغەمبەرﷺ هەمووی نەهاتبووە خوارێ. بەلکی چەند ئایەتێکی کەمیش لەپاش ڕەمەزانی ئاخیر هاتە خوارێ. حیکمەت لە دووبارەبوونەوەی خوێندنی قورئان بەم شێوەیەی باس کرا لەبەینی پێغەمبەر و جبریل، چەسپاندن و مانەوەی ئەو جۆرە خوێندنەیە کە لە مەصحەفی عوسمان نووسراوە، چونکی لە ڕەمەزانی ئاخیر خوێندنەکەیان تەنیا لەسەر قیرائەتی مەصحەفی عوسمان بوو کە ئێستا وولاتەکانی موسوڵمان هەموویان لەسەر ئەم جۆرە قیرائەت و خوێندنەن لە قورئانی پیرۆز.

١١١٩: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّـهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعیدی خودری رضي الله عنه گوتی: پیاوێك گوێی لە پیاوێك بوو هەر (قل هـــو الله أحد)ی دەخوێند، ئەوی گوێی لێبوو هەر خۆی بوو، ئەوەی دەشی خوێند قەتادەی کوری نەعمان بوو.لەگەڵ ئەبوسەعید لەدایکەوە برابوون، ئەوی گوێشی دابوێ خوێندنی سورەتی

(اخلاص)ی بەخواپەرستی‌یەکی کەم دەزانی، بەپێغەمبــەری گــوت، پێغەمبــەرﷺ فــەرمووی: سوێند بەو زاتەی کە ڕوحی منی بەدەستە، سورەتی (قل هـــو الله) بـەگوێرەی مەعنایـەکانی قورئان، بەرامبەرە لەگەڵ سێ‌یەکی قورئان.. چونکە مەعنایەکانی قورئان سێ بەشە: بەشێکی ئەحکامە، دووەم سەربردە و چیرۆك و حیکایەتە، سێیەم تــەوحید و خـوا بەیـەك زانینـە کـە سورەی (اخلاص) جۆرەکانی خوابەیەك زانینی تێدایە، لەگــەڵ هــەبوونی دوو نـاوی تایبــەت و (مختص) بەزاتی خودای گەورە. کە لە هیـــچ ســورەتێکی‌تر نی‌یـە، یـەکی‌یان (أحـد)ە کـە بـە اختصاص بەڵگەیە لەسەر یەکایەتی خودای گەورە کەوەصف کراوە بەهەموو ئەوصافی کەمال، دووەم (صمد)ە کە ناوە بۆ زاتی پێویست بۆ جێبەجێ‌کردنی هــەموو پێویســتی‌یەك وە هــەموو وەصفێکی خودای تیا کۆبووبێتەوە.

قەومێکیش گوتویانە دەربارەی پاداشت بەرانبەرە لەگەڵ پاداشتی خوێندنی ٣/١ سێ‌یەکی قورئان، ئەمەش لە بەخشینی خودای گەورە دوور نی‌یە.

١١٢٠: عَنْ أَبي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ لأَصْحَابِهِ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآن فِي لَيْلَةٍ؟ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا: أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ ثُلُثُ الْقُرْآن.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لــە ئەبوسـەعیدی‌ﷺ فــەرمووی: ئـەرێ عــاجز دەبـی یـەکێکتان کـە بخوێنـێ سی‌یەکێکی قورئان لە شەوێك؟ ئەصحابیش پێ‌یــان زەحمــەت بـوو، پێ‌یـان گـوت: کامــەمان ئەتوانێ ئەمەندە بخوێنێ لەشەوێك ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: سورەی (قل هـــو الله أحد) کە دوو ووشە(کلمە)ی ئەحەد و صەمەد ئەگرێتەوە تایبەتە بەزاتی هــەرەپیرۆزی خـودای گەورە وە بەبێ ئەو وشانە لەسورەتەکانی تری قورئان سێ‌یەکێکی قورئانە.

١١٢١: عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ، قَالَ اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ، قَالَ: وَتَدْرِي مَا ذَاكَ؟ قَالَ: لا، قَالَ: تِلْكَ الْمَلائِكَةُ دَنَتْ لِصَوْتِكَ، وَلَوْ قَرَأْتَ لأَصْبَحَتْ يَنْظُرُ النَّاسُ إِلَيْهَا لا تَتَوَارَى مِنْهُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئوسەیدی کوڕی حوضــەیرﷺ گوتــی: شــەوێك ســوورەی (بقــرە) یــا ســـورەی (کهف)ی دەخوێند، ئەسپەکەیشی لای خـۆی بەســترابۆوە، لــەناکاو دیتــی ئەسپەکەی کەوتــە جووڵانەوە، ئەویش لەخوێندنی قورئان ڕاوەستا ئەسپەکەش ڕاوەستا نەجووڵا، دیســان خوێنــدی

ئەسپەکەی کەوتەوە جوولانەوە، یەحیای کوڕیشی لەنزیك ئەسپەکە بوو، ترسا بکەوێتە ژێر دەست و پێی ئەسپەکە.. وەکو کوڕەکەی ڕاکێشا، تەماشای ئاسمانی کرد چاوی بە هەورێکی سپی کەوت چەند چرایێکی تیا دیار بوو، بەلام هەوراز ڕۆیی لەپێش چاوی بزر بوو، کەوتە سبەینە ئەم قسەی بۆ پێغەمبەرﷺ کرد، پێغەمبەر دووجار فەرمووی ئەی کوڕی حوضەیر بخوێنە ئەی کوڕی حوضەیر بخوێنە، یەعنی کاشکی هەر بت خوێندایە. خوێندنی قورئانت نەبڕاییبوایە، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ترسام لە کوڕەکەم یەحیا، نەوەك وڵاغەکە پێی لێ بنێ، چونکە لێی نزیك بوو، منیش سەرم بلند کرد بۆلای کوڕەکەم چووم بۆ ئاسمان سەرم هەلبڕی، پەلەهەورێکم دیت، چەند جەستەیەکی لەشێوەی ڕۆناکیم دیت (ئەجسامی نوورانی) وەکو قندیلان تیا دیار بوو. پاشان بلند بوو لەپێش چاوم بزر بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەزانی ئەمە چی بوو؟ گوتم: نا، فەرمووی: ئەمە مەلائیکە بوون، لەبەر دەنگی خوێندنی قورئان لەتۆ بەنزیك کەوتبوون، ئەگەر هەر دەوامت بکردایە لەخوێندنەکەت نەدەڕۆیشتن، هەتا خەلکی تەماشایان دەکردن خۆیان نەدەشاردەوە.

١١٢٢: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ فَقَالَ لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهُوَ يُهْلِكُهُ فِي الْحَقِّ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ، فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەسوودی (یەعنی داواکردنی وەرگرتن وەکو خەلکانی تر) دروست نی یە حەسوودی تەنیا لە دوو شت نەبێ: یەکێ یان پیاوێك خودا قورئانی فێرکردبێ، ئنجا لەکاتەکانی شەو لە سەعاتەکانی ڕۆژ بیخوێنێ، ئنجا جیرانیشی گوێیان لێبێ، بلێ: خۆزیا منیش وەکو ئەم پیاوە خودا ئەم چاکەشی لەگەل من بکردایە، ئنجا منیش وەکوو ئەو قورئانم بخوێندایە، دووەم: پیاوێك خودا مالێکی پێدابێ ئنجا صەرفی بکا لە کاروباری چاکە، پیاوێکی تریش بلێ: کاشکی بەمنیش بدرایە وەکوو ئەم مالەی کە بە ئەو پیاوە دراوە، منیش بۆ خۆم وەکو ئەو لەڕێگای خودا سەرفم بکردایە.

(ش): گوتراوە لەم حەدیسە پیرۆزەدا هەیە تایبەت کردنی جۆرێك لە حەسوودی، ئەگەر چی حەسوودی بەتەواوی حەرامە چونکە بەرژەوەندیەکی (مەصلەحەت) شایینی تێدایە هەروەکو ئەبو تەمام گوتیتی: (وما حاسدٌ في المكرُماتِ بحاسد).

١١٢٣: عَنْ عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عوسمان‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشترینی ئێوە ئەو کەسەیە کە قورئان فێر ببێ یا قورئانی فێری خەڵکی کردبێ، یەکێك لەم دوو صفەتەی تێدابێ بە مەرجێك لەئێوەدا نەبێ ئەم صفەتانە.

١١٢٤: عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَفْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزردتی عوسمان‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی گەورەترینی ئێوە ئەو کەسەیە کە قورئان فێر بووبێ وە فێری خەڵکیشی کردبێ، یەعنی هەرکەسێك فێری قورئان و بووبێ و خەڵکیشی فێر کردبێ هەندێکە لە باشترینی ئێوە، چونکی لەدوای (انَّ) منی تبعیضیة مقدَّرة، شێخی شەرقاوی وای فەرمووە، لەبەر ئەم حەدیسە پیرۆزە (ثەوری) فێرکردنی قورئانی پەسەند تر کردووە لە جهاد و شەڕ لەگەڵ کافران کە فەرزی کیفایەیە.

١١٢٥: عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عومەر‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی صفەتی ئەو کەسەی خوی گرتبێ بە خوێندنی قورئان، وەکوو ماخۆ وشترێکی بەسترایەوەیە بە عەقال (کە پەتکێکە لە ملی ووشتر دەکەن) ئەگەر پارێزگاری بکا لەژێر فەرمانی خاوەنەکەی دەوام دەکا وە ئەگەر بەرەڵای بکا و نەشی بەستێتەوە دەڕوا..

ئەمە تایبەتە بەو کەسەی قورئانی لەبەر بێ، یەعنی ئەگەر دائم دەوری نەکاتەوە لەبیری دەچێتەوە.. ئەگەر دەوامیش بکا لەسەر دەورکردنەوەی بۆی دەبێتە ماڵ لە دونیاو قیامەت.

١١٢٦: عَنْ عَبْدِاللَّهِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِئْسَمَا لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ نُسِّيَ، وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ

مِنَ النَّعَمِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی مەسعود ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتێکی بەدە بۆ یەکێکیان کە بڵێ فلان ئایەتی ووهاو وهام لەبیر چووە، (چونکی وا دەگەیەنێ درێغی کردووە لە قورئان خوێندن) بەڵکی بڵێ لەبیرم براوە لەلایەن خودا، چونکە ئەمە سەلماندنە بە تەواوی گەورەیی خودا، وە داوای بەبیرخستنەوەی قورئان بکەن لە خۆتان، چونکی قورئان بۆ ڕاکردن لەنێو سنگتان سەخت ترە لە ووشتر (چونکی قورئان قسەی مرۆڤ نی‌یە، قسەی خالقی گەورەی کردگارە و بەتەوانایە، لەبەینی خوداو بەندەی خۆی موناسەبەی نی‌یە چونکی مرۆڤ تازە دروست کراوی خودایە، بەلاّم خودا قەدیمە و ئەبەدیە، ئنجا خودای گەورە کە ئەم چاکە گەورەی لەگەڵ خەڵکی کرد پێویستە بۆ لەبیرنەکردنی زۆر اعتنای پێ بکرێ.

١١٢٧: عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوموسى عبداللەی کوڕی قەیسی ئەشعەری ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاگادار بن لە قورئان لەبەرکردن و خوێندنی دووبارەو سێبارە، سوێندم بەو زاتەی روحی منی بەدەستە، بێشك قورئان سەخت ترە بۆ نەجات لەنێو دڵان لە ووشتر لە بەندی خۆی.

١١٢٨: عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: يَا أَبَا مُوسَى، لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوموسى‌ی ئەشعەری ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئەی ئەبو موسى بەڕاستی ئاوازێکی خۆشت پێدراوە وەکو ئاوازی خۆشی داود.

(لەفظی (آل) زیادکراوە چونکە نەزانراوە لەکەس و کاری داود یەکێك دەنگی خۆش بووبێ).

١١٢٩: عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْكَحَنِي أَبِي امْرَأَةً ... الْقَنِي بِهِ، فَلَقِيتُهُ بَعْدُ، فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ قَالَ: كُلَّ يَوْمٍ. قَالَ: وَكَيْفَ تَخْتِمُ؟ قَالَ: كُلَّ لَيْلَةٍ، قَالَ: صُمْ فِي كُلِّ شَهْرٍ ثَلاثَةً وَاقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ شَهْرٍ، قُلْتُ: أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فِي

الْجُمُعَةِ، قُلْتُ: أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: أَفْطِرْ يَوْمَيْنِ وَصُمْ يَوْمًا، قُلْتُ: أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: صُمْ أَفْضَلَ الصَّوْمِ صَوْمَ دَاوُدَ؛ صِيَامَ يَوْمٍ وَإِفْطَارَ يَوْمٍ، وَاقْرَأْ فِي كُلِّ سَبْعِ لَيَالٍ مَرَّةً..

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص گوتی: باوکم ژنێکی وجاغ زادەو باشی لێ مارەکردم، هەرجارە باوکم لە ئەحواڵی بووکەکەی دەپرسی، جارێك لێی پرسی، گوتی: مێردەکەت چلۆنە؟ گوتی: پیاوێکی باشە، پێی لە نوێنی ئێمە نەناوە وە دەستی خۆشی نەخستۆتە نێو لیباسی ئێمە، لەو کاتەوە کە هاتومەتە لای (یەعنی لەگەڵم جووت نابێ).. عەمریش لەترسی گوناحکاربوونی کوڕەکەی بە سەبەب سەرجێ‌نەکردنی بووکەکەی، چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ قسەی بووکەکەی پێ گوت، فەرمووی: عبداللە ی کوڕت بێنە لام.. عبداللە گوتی: منیش لەپاشان چووم خزمەتی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چلۆن بەڕۆژوو دەبی؟ عبداللە گوتی: هەموو رۆژێك.. فەرمووی: ئەدی ختمی قورئان چلۆن دەکەی؟ پێم گوت: هەموو شەوێك.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر مانگێك سێ‌ڕۆژ بەڕۆژوو بە، لەهەر مانگیش یەك ختمی قورئان بکە.. پێم گوت: تاقەتی زیاترم هەیە، فەرمووی: لەسێ رۆژ یەك رۆژی بەڕۆژوو بە، بەم تەرزە دوو ڕۆژ پی مەبە رۆژێك پێ‌بە. پێم گوت: تاقەتی زیاترم هەیە، فەرمووی: بەگەورەترین ڕۆژوو بەڕۆژوو بە، رۆژی داود کە رۆژێك بەڕۆژوو دەبوو رۆژێکیش پێ‌نەدەبوو، لە هەرهەفتەیەکیش یەك ختم بکە(ئەی کاشکی روخسەتەکەی پێشوم لە پێغەمبەر قبووڵ دەکرد، چونکی بە تەمەن گەورە بوبە بێ‌تاقەت بوبە، ۷/۱ حەفتێ‌یەکی قورئان بەڕۆژ لای هەندێ ئەهلی خانووی ئەوەی کە دەی‌ویست بەشەو بخوێنێ بەڕۆژ دەیخوێند بۆ خاتری دەورەکانی شەوی لەسەر سووك بێ، دەربارەی رۆژووش بۆ ئەوەی هێزێکی بەبەر بێتەوە وادەبوو رۆژانەکی زۆر بەڕۆژوو نەدەبوو، بەڵام هەمووی دەژمارد، پاشان چەند رۆژێکی شکاندبووی هەمووی دەگرتەوە، نەوەکو شتێکی وای لەدەست بچێ، لەسەر ئەو شت لەپێغەمبەر جیابۆوە (درودی خوای لەسەر بێ).

١١٣٠: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلَاتَكُمْ مَعَ صَلَاتِهِمْ وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ وَعَمَلَكُمْ مَعَ عَمَلِهِمْ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ يَنْظُرُ فِي النَّصْلِ فَلَا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظُرُ فِي الْقِدْحِ فَلَا يَرَى شَيْئًا وَيَنْظُرُ فِي الرِّيشِ فَلَا يَرَى شَيْئًا وَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعیدی خودریﷺ گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قەومێك پەیدا دەبێ لەنێوە، نوێژی خۆتان بەگوێرەی نوێژی ئەوان بەکەم دەزانن، ڕۆژووی خۆشتان بەگوێرەی ڕۆژووی ئەوان بەکەم دەزانن، وە کارەچاکەکانی تری خۆتان بەگوێرەی کارەچاکەکانی ئەوان بەکەم دەزانن، وە قورئانیش دەخوێنن بەڵام لە گەروویان تێناپەڕێ بۆ نێو دڵیان و دەروونیان، لە دینی ئیسلام دەردەچن وەکوو دەرچوونی تیر بەتیژی و لووسی لە جەستەی نێچیر، بەم بەرزە تیراندازەکە تەماشا بکا هیچ بەشێك لە کەلاکی نێچیرەکە بەسەری تیرەکەوە نییە، وە تەماشای باسکە تیرەکەشی بکا ئەویش هیچی پێوە نەبێ، وە تەماشای پەڕی تیرەکەش بکا ئەویش هیچی پێوە نەبێ، وە گومانێکیش ببا لە قوونکی تیرەکەی قەڵشاو بۆ گیربوونی لەسەر داوی کەوان (چونکە عادەتە قوونکی تیرە دەقەلیشن بەقەدەر جێگای داوی کەوان تا لەکاتی ڕاکێشانی تیر لەسەر داو نەجوولێ) کە ئایا بەهیچ بەشێك لە جەستەی نێچیرەکە بەقونکی قەڵشاوی تیرەکەوەیە یان نا.

(ش): مەبەست لەدین ئەگەر دینی ئیسلام بێ حەدیس هەڵ دەگری ئەم قەومە کافر بن، ئەگەر مەبەستیش لەدین بەگوێ‌کردنی ئیمام بێ. نابێتە بەڵگە (حوجەت) بەکافربوونیان بەڕای زانایانی ئیسلام، خەوارج لەسەر ڕێبزرکردنی خۆیشی یان کۆمەڵێکن لەسەر ئیسلام. دروستیشیان کردووە، ژنیان لێمارەبکرێ یان ژنیان لێ بخوازرێ وە خواردنی دەست کوژیان وە قبووڵی شاهید یان، پرسیاریان لە حەزرەتی عەلی کرد، ئەرێ ئەم کۆمەڵە کافرن؟ گوتی: لەکوفر هەڵاتوون، گوتیان: ئەدی منافقن، گوتی: منافق یادی خودا ناکەن، کەم تەبێ، ئەمانە ئێوارەو سبەینە یادی خودا دەکەن، گوتیان ئەدی ئەمانە چین، گوتی ئەمانە قەومێکن فتنەیەکیان تووش بووە کەڕ و کوێر بوونە.

١١٣١: عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُؤْمِنُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَالْمُؤْمِنُ الَّذِي لا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالتَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ أَوْ خَبِيثٌ وَرِيحُهَا مُرٌّ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لەئەبوموسی ئەشعەریﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: صفەتی ئەو ئیماندارەی کە قورئان بخوێنێ و کاریشی پێ بکا، وەکو سفەتی ترنج وایە تامەکەی خۆشەو بێنیشی خۆشە وە ئەو ئیماندارەی کە قورئان بەدەوام ناخوێنێ و کاریش بە ئەحکامەکانی دەکا وەکو خورما وایە

تامەکەی خۆشەو هیچ بێنی نی‌یە. صفەتی منافقیش کە قورئان دەخوێنێ وەکو رەیحانــە وایـە بێنەکەی خۆشە و تامی تاڵە. صفەتی منافقێکیش قورئان ناخوێنێ وەکو گوژاڵکـە تامەکـەی تاڵە یا فەرمووی پیسە. هیچ بێنیشی نیە. یا فەرمووی: بێنیشی تاڵە.

١١٣٢: عَنْ جُنْدَبٍ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْــــهِ قُلُوبُكُمْ فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جوندوبی کوڕی عبداللە ﷺ لە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قورئان بخوێنـن هـەتا دڵتان لەسەر قورئان خوێندن کۆیە و موشتاقی خوێندنن، پاشان وەکو دڵتان بڵاوبـوو شـەوقتان لەسەر قورئان خوێندن نەما، وازی لی‌بێنن، چونکی دڵتان ئاگای لە خوێندنەکە نامێنـێ، ئـەو کاتە نەخوێندن باشترە لە خوێندن.

## کتاب النكاح

## باسی ژن هێنان

١١٣٣: ٤٦٧٥ عَنِ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّــهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّــي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەس ﷺ سێ چینە ئەصحاب هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، عـەلی کـوڕی ئەبو تالب و عبداللەی کوڕی عەمری و کوڕی عاص وە عسمانی کوڕی مـەضعون لـەوان بـوو، دەربارەی خواپەرستی پێغەمبەر پرسیاریان لە دایکی ئیمانداران کرد گۆیا خواپەرستی‌یەکەیان بەکەم زانی پاشان گۆتیان ئێمە لەکوێ و پێغەمبەرﷺ لەکوێ، خودا فەرموویتی ﴿لِيَغْفِرَ لَــكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾.. پاشان یەکێکیان گوتی: من بەشێوەیەکی هەمیشەیی هـەموو شەو نوێژ دەکەم، یەعنی بەبێ ئەوەی شـەوێك باز بکەم، ئەوی تریش گوتی: من ساڵ هـەمووی بەرۆژوو دەبم بێ لەدوو جەژنەو سێ رۆژی جەژنی قوربان(أيام التشريق)، ئـەوی تریـش گوتـی: ببڕای ببڕای(بە قەطعی) ژن نایەنم.. پاشان پێغەمبەر تەشریفی هاتـە لایـان، فـەرمووی: ئـەوە ئێوەن واتان گوتووە وە واتان گوتووە، واللە، دەنا من بەبێ شك و گومان لەئێوە زیاتر لە خـودا دەترسم وە زیاتر لەئێوە بەتـەقواتر و بـەدین تـرم، بـەڵام بـەرۆژووش دەبم و دەشی‌شـکێنم، وە نوێژیش دەکەم و راش دەکشێم و ژنانیش دەینم، ئنجا هەرکەسێکیش رێگاو رەوشتی مـن بـەر

بدا بەجهەتی ڕك لیٚبوونەوە لەمن نی‌یە، یەعنی موسوڵمان نی‌یە، چونکی کلمەی شەهادەش لەڕێگاو ڕەوشتی پێغەمبەرەﷺ.

(ش): زۆر ڕای جۆربەجۆر هەیە کە ژن هێنان لە خواپەرستی‌یە(عبادات)ە، حەنەفیەکان گوتویانە لەخواپەرستی‌یە. سونەتێکی وایە پێغەمبەرﷺ تەئکیدی لەسەر کردووە، شافعیەکانیش گوتوویانە لەخواپەرستی‌یە. هەتا لە شەرحی وەسیط گوتراوە نەصی امام الحرمین لەسەر ئەمەیە ژن هێنان لە ویستی مرۆڤ خۆیەتی یەعنی لە(شەهەواتە) و ئارەزووی نەفسە، لە عبادات نی‌یە.

لە پەرتووکی (الام)ی ئیمامی شافیعی هەر ڕای لەسەر ئەمەیە بە بەڵگەی ئایەت کە دەفەرموێ (زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ...الخ) لە حەدیسیش هاتووە دەفەرموێ: (حُبِّبَ إِلَيَّ مِن دُنْيَاكُمُ الطِّيبُ وَالنِّسَاءُ) واتە لە دونیای ئێوە دوو شتم لای خۆشەویست کراوە بێنێ خۆش و ئافرەت. ئەوەویش گوتیتی: ژن هێنان ئەگەر بەنی‌یەتێکی باش بێ مەبەست لە ژن هێنانەکە پاکبونی لەخراپەو سونەت بەجێ‌گەیاندنی پێغەمبەر و یان بۆ ئەوەبێ منداڵێکی باش و صالحی لیٚ پەیدا بی، ئەمەیان خواپەرستی‌یەو عبادەتە هەتا بۆ پیاوی خەساویش.

١١٣٤: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لاقٍ فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ أَوْ ذَرْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: بە پێغەمبەرم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا، من نەوجەوانم، جحێڵم، لەزینا خۆم دەترسێم، هیچیشم نی‌یە ژنی پێ بینم؟ پێغەمبەرﷺ قسەی نەکرد، دووبارە گوتم، دیسان قسەی نەکرد، دیسان پێم گوتەوە، دیسان قسەی نەکرد، ئەمجارەش پێم گوتەوە، فەرمووی: ئەی ئەبوهورەیرە، ئەو قەڵەمی کە ئەحوالی تۆی پێ‌نووسراوە لە لەوح لەتووش‌بوونی زیناو شتی‌تریش کە بەسەرت بێ تووشت هەر دەبێ، ئنجا لەسەر ئەم حاڵەی کە دەزانی هەموو شتێك بە قەزاو حوکمی خودایە، خۆت بخەسێنە یا واز لە خۆت بێنە.

(ش): ئەمر لێرە بۆ ترساندن و تەهدیدە لەسەر تەرکی خەساندن، هەروەکو ئەو شتەی ڕووی دابی(ئەمری واقع) لەم ئایەتە کە دەفەرموێ: (وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ) یەعنی نەکەی خۆت بخەسێنی.

١١٣٥: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِيًا وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ أُكِلَ مِنْهَا وَوَجَدْتَ شَجَرَةً لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ بَعِيرَكَ؟ قَالَ:

فِي الَّتِي لَمْ يُرْتَعْ مِنهَا، تَعْنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْرًا غَيْرَهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائشە (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا ئاگادارم بکە، ئەگەر لە شیوێك دابیەزی لەوەڕێکی هەبیٚ لیٚی خورابیٚ، چاویشت بە لەوەڕێك کەوت لیٚی نەخورابیٚ، لە کامە لەوەڕ ووشتری خۆتی لیٚ دەلەوەڕێنی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەو لەوەڕەی نەخوراوە. مەبەستی عائشە ئەمەبو پێغەمبەری خواﷺ بیٚ لە حەزرەتی عائشە لە دایکەکانی ئیمانداران هیچیانی بە کچێنی نەهێنا (یەعنی پێویستە فەرقی بکریٚ لەگەڵ ئەوانی تر).

١١٣٦: عَنْ عُرْوَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ عَائِشَةَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: أَنْتَ أَخِي فِي دِينِ اللَّهِ وَكِتَابِهِ وَهِيَ لِي حَلَالٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوا لیٚی رازی بیٚ) پێغەمبەرﷺ داخوازی حەزرەتی عائشەی لە حەزرەتی ئەبوبەکر کرد، ئەبوبەکر گوتی: بیٚشك من هەر برای تۆم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ برای منی لە ئایینی ئیسلام کە ئایینی خودایە، وە لە کتابی خودا کە قورئانە، چونکە فەرموویەتی: (إنما المؤمنون إخوة) یەعنی برایەتیەکەمان لە ئایینە لە ڕەچەڵەك (نەسەب) نییە. هەتا لێم حەرام بیٚ، بەبرایەتی دینیش لێم حەرام نابیٚ، بەڵکی ئەم کچەی تۆ بۆ من حەڵاڵە.

١١٣٧: عَنْ عَائِشَةَ، دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ فَقَالَ لَهَا: لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الْحَجَّ؟ قَالَتْ: وَاللَّهِ لا أَجِدُنِي إِلاَّ وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: حُجِّي وَاشْتَرِطِي وَقُولِي اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) پێغەمبەریﷺ تەشریفی فەرمووە لای ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عبدالمطلب، فەرمووی: ئەی ضوباعە! لیٚوەشاوەیە بتەوێ حەج بکەی؟ پیٚی گوت: واللە من نەساغم، فەرمانی پیٚکرد حەج بکەو شەرتیش بکە بڵیٚ ئەی خودایە جێگای تەحەمولی من لە ئیحرام، ئەو جێگایەیە کە منت لەوێ حەپس کرد، بەهۆی نەساغی کە نەتوانم پێویستییەکانی حەج (مناسك) جیٚبەجیٚ بکەم بەهەموو مەرجەکانی.

ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو.. (ئەمە لەعەینی وادەڵیٚ)، (ڕای جۆراوجۆر

هەیە لە دروست بوونی ئەم مەرجە، لای قسـەی دیـاری امـامی شـافعی دروسـتە، ئیمـامی ئەحمەدیش لەسەر ئەم قسەیە لای ئیمامی حەنەفی و مالك ئەم مەرجە بۆ بەجێگەیاندنی حەج کەلکی نیە، دەبێ لەسەر ئیحرامی خۆی بڕوا هەتا هـەموو پێویسـتی‌یەکانی حـەج جێبـەجێ دەکا نابـێ تەحـەلول بکـا) هـەندێ لـە زانایـان ئـەم حەدیسەشیان کردوتـە بەڵگـە لەسـەر اعتبارنەکردنی کەفائەت و هاوشانی لە نەسەب و ڕەچەڵەك، چونکی میقدادی کوڕی عـەمری ثعلبەی کوڕی مالیکی کیندی بوو بە سەبەب تەبەنی دەخرایە پاڵ ئەسوەدی کـوڕی عـەبدی یەغوثی کوڕی وەهبی کوڕی عەبدی مـەنافی کـوڕی زوهـرەی زەهـری، واتـە بـە کـوڕی ئـەو دادەندرا، پاشان لە جاهیلیەت موخالەفەی کردوە پێچەوانە جوولایەوە، ضوباعـەش لـە بـەنی هاشم بوو ئامۆزابوو لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ، بـەڵام لەوانەیـە خـۆی و سـەرکردەکانی اسقاطی کەفائەتی خۆیان کردبێ.

١١٣٨: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: تُنْكَـحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەرضي الله عنه پێغەمبەرﷺ فەرمووی: عـادەتی خـەڵکی وا ڕۆیشـتووە ژن مارە دەکرێ لەبەر هەبوونی یەکێك لەچوار خەسڵەت کە لە ژنەکـەدا هـەبێ، یـەکی‌یان مـاڵی هـەبێ بـەڵکی بـەهۆی مـاڵی خـۆی پێویسـتی زۆری بەمێردەکـەی نابـێ لـە داواکردنـی پێویستی‌یەکانی خۆی لە مێردەکەی وە بەڵکی منالێکیشی دەبێ لەپاش خـۆی ماڵەکـەی بـۆ منالەکەی دەگەڕێتەوە. دووەم: ناوو شەرەفی هەبێ لەلایەن باب و باپیر و خزمەکانی. سـێیەم: جوان و شیرین بێ، چونکی جوانی لەهەموو شتێك هەر پێویستە بەتایبـەتی لـە ئافرەت کـە شەوو ڕۆژ لەگەڵی‌دای. چوارەم: لەخواترس و بەدین بێ.. ئینجا بەژنی دینـدار زەفـەر ببـە دوو دەستت خۆڵاوی بێ کە مایەی هەژاریە.

(ش): لە ژنی دیندار بە لەفزی زەفەر ئەدای فەرموو هەتا بزانرێ کە دین لەسەر هـەمووی پەسندترە، یەعنی ئەگەر ژنێك هەبێ دیندار بێ بـەس، ژنێکیـش هـەبێ دینـدار نـەبێ بـەڵام دەوڵەمەند بێ و جوان بێ و خاوەن ڕێ و جێ بێ، دیندارەکە هەڵبژێرە چونکە نیعمـەتێکی زۆر گەورەیە بۆ دونیاو قیامەت، چونکی لەدوایی حەدیسێکی درێژ لە کوڕی عومەر دەگێڕنەوە بـە مەرفوعی ریوایەت کراوە (لأمة سوداء ذات دين أفضل).

١١٣٩: عَنْ سَهْلٍ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ وَإِنْ قَالَ أَنْ يُسْتَمَعَ.. قَالَ: ثُمَّ سَكَتَ، فَمَرَّ رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لا يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لا يُشَفَّعَ وَإِنْ قَالَ أَنْ لا يُسْتَمَعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ مِثْلَ هَذَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ئەنصاری ﷺ، گوتی: پیاوێکی دەوڵەمەند بەلای پێغەمبەر ﷺ دا ڕەت بوو، ڕاست و ڕاست بە ئەصحابی گوت: ئێوە چی دەڵێن دەرحەق بەم پیاوە؟ پێیان گوت: ئەمە پیاوێکی باشە شایانی ئەوەیە ئەگەر ژن داخوازی بکا پێی بکەن وە ئەگەر تکاش بکا تکای قبوڵ بکەن، وە ئەگەر لە ئەنجومەنێك قسە بکا گوێی دەدەنێ.. سەهل گوتی: پاشان قسەی نەکرد، پاشان پیاوێکی هەژاری موسوڵمان بەوێدا ڕەت بوو، فەرمووی: ئەدی لەم پیاوە چی دەڵێن؟ پێیان گوت: ئەم هەژارە لێی دەوەشێتەوە ئەگەر ژن داخوازی بکا پێی نەدەن، وە ئەگەر تکاش بکا تکای قبووڵ نەکرێ وە ئەگەر قسەش بکا لە ئەنجومەنان هیچ کەسێك گوێی نەداتێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە هەژارە پڕ بە عارد لە یەکێکی وەکوو ئەم پیاوە دەوڵەمەندە باشترە.

(ش): بە گوتنی ئەوەی کە ئەم پیاوە لە یەکێکی وەکوو خۆی دەوڵەمەند باشترە وا نیە وا بگەیەنی کە هەموو هەژارێك لە دەوڵەمەند باشترە، بەڵکو ئەگەر بەدین تر بێ.

١١٤٠: عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەپاش خۆم جێم نەهێشت فتنە و إمتحانێك لە چینی ژنان بەزەرەرو زیانتر بۆ پیاوان (چونکی ناقصات العقلن، پیاوانیش ناچار دەکەن بە شتی وا کەمی دین و عەقڵی تیا هەبێ، بەڵکی لەسەر داواکردنی دونیا وایان لێ دەکا خۆیان بە هیلاك بدەن.)

١١٤١: عَنْ عَائِشَةَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُرَاهُ فُلاناً لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، نَعَمْ الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلادَةُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لیڕازی بێ) گوتی: گوێم لە دەنگی پیاوێك بو داوای ماوەدانی دەکرد کە بێتە ژووریٚ لەخانووی (حەفصە) منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە پیاوێك لەدەرگەی خانووی حەفصە دەدا داوای ماوەدان دەکا. فەرمووی: وای بۆ دەچم ئەمە فلانە بۆ مامی شیری حەفصە داوای ئیزن و ماوەدان دەکا، عائشە گوتی: فلانیش لەژیان بوایە کە مامی شیریم بوو ئەهاتە لام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەلێ وایە، شیرخواردن حەرام دەکا هەرچی کە نەسەب (نزیکی خزمایەتی) حەرامی دەکا، چونکی شیردەرەکە دەبێتە دایکی شیری. مێردەکەشی ئەبێتە باوکی. ئنجا اصول و فروعی هەردووکیان (واتە خزمەکانی باوك و دایکی و منداڵەکانی هەردوویان) و خوشکەکان و برایەکانی هەردوویان لەشیرخواردوو حەرام دەبێ، چونکە دەبێتە پلك و پور و مام و خاڵی شیری.

١١٤٢: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قِيلَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلا تَتَزَوَّجُ ابْنَةَ حَمْزَةَ قَالَ إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس ﷺ عەلی کوڕی ئەبوطالب بە پێغەمبەری گوت: بۆچی کچی حەمزەی مامت لەخۆت مارە ناکەی؟ لە شیرینترینی کچەکانی لاوچاکی قورەیشە، فەرمووی: کچی حەمزە کچی برای لەشیریە، لێم حەرامە.

(ش): حەزرەتی عەلی لەوانەیە نەیزانیبی کە شیریان پێکەوە خواردووە، یاخۆ وای زانیبی کە دروستە بۆ پێغەمبەر کە بیهێنێ.

١١٤٣: عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، فَقَالَ: أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكِ ؟ إنَّ ذَلِكِ لا تَحِلُّ لِي، قُلْتُ: فَإِنَّا نُحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ؟ قَالَ :بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ.. فَلا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلا أَخَوَاتِكُنَّ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران ئومی حەبیبە، ڕەملەی کچی ئەبوسفیان، صەخری کوڕی حەرب، ڕەزای خواوەندی عالەمیان لیبێ، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، خوشکی من عەززە لەخۆت مارە بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا پێت خۆشە ئەمە بکەم؟ گوتم: بەلێ، چونکی من خۆمن وا نیم هیچ هەویێ ترم نەبێ، وە بەبەشداربوون لە خۆشیەکانیشم خوشکی

خۆم لەهەموو کەسێك پێ‌خۆشترە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کۆکردنەوەی دوو خوشك لەژێر نیکاحی یەك پیاو حەلاڵ نیيە، پێم گوت: ئێمە قسەمان بۆ دەکرێ تۆ دەتەوێ دورەی کچی ئەبوسەلەمە لەخۆت مارە بکەی. پێغەمبەرﷺ بەلای سەرسوڕمان فەرمووی: کچی ئومە سەلەمەی خێزانم؟ پێم گوت: بەڵێ، فەرمووی: ئەم کچە ئەگەر دایکیشی خێزانی من نەبوایەو ئەویش بەخێوکراوی من نەبوایە، لەمن هەر حەلاڵ نەبوو مارەی بکەم، چونکی کچی برای شیریمە، ثوییبە جاریەی ئەبولەهەب شیری بە من و ئەبوسەلەمە داوە، ئنجا بۆ مارەکردن کچی خۆتان و خوشکەکانی خۆتان پێشکەشی من مەکەن یان داوام لێ‌مەکەن کە مارەیان بکەم (یەعنی نە ئومی سەلەمە ئارەزوو بکا کچی ئەبوسەلەمە بێنم نە تۆیش ئەی ئومی حەبیبە ئارەزوو بکە خوشکت بێنم).

١١٤٤: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهَا قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا عَائِشَةُ انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە(خوای لێ‌ڕازی بێ) پێغەمبەرﷺ چووە لای دیتی پیاوێکی لا دانیشتبوو، پێی ناخۆش بوو، رووی پیرۆزی گۆڕا، حەزرەتی عائشە فەرمووی: ئەمە برای شیریمە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەباشی تەماشا بکەن، برایەکانی شیریتان کێن، چونکی لێ‌حەرام بوون بەشیر ناسەلمێندرێ(ثابت نابی) الا مەگەر بە شیرێك نەبێ پارێزگاری ژیانی مناڵە شیرەخۆرەکە بکا لە هیلاکبوونی برسیەتی، یەعنی مناڵەکە لە تەمەنێکی وابێ هیچی تری پێ نەخورێ کە پێ بژێ شیر نەبێ.

(ش): ئیمامەکان و موجتەهیدەکان بە وەرگرتن لەم حەدیسە پیرۆزە لەو شیرەی دەبێتە هۆی حەرام بوونی ژن لە پیاو کە مارەی بکا ڕای جیاجیایان هەیە، لای ئیمامی شافعی و جمهور ئەبێ شیرەکە لەپێش تەواوبوونی تەمەنی مناڵەکە بێ کە ببێ بە دووساڵ، ئەبێ پێنج جاریش بێ، لای ئیمامی حەنەفیش ئەبی لەپێش تەواوبوونی دو ساڵ و نیو بێ، لای ئیمامی مالك ئەبێ لەپێش تەواوبوونی دووساڵ و چەند رۆژێك بێ.. لای زەفر ئەبێ لەپێش تەواوبوونی سێ‌ساڵ بێ. بە شیرخواردنی یەك جار تەصریحی نکاح ثابت نابێ(واتە ژن لە پیاو حەرام نابێ کە مارەی بکا)، لای ئیمامی مالك و ئەبوحەنیفە و مەزهەبی ئەحمەد ئەبێ.

١١٤٥: عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا فَاسْتَمْتِعُوا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللە و لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، گوتیـــان: لـە لەشـکرێك پێغەمبەرﷺ هاتە لامان، فەرمووی: ئیزن درا بـۆ ئێـوە نکـاحی موتعـە بکـەن، یـەعنی ژن مارەکردن بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئینجا سوود لەم جۆرە ژن مارەکردنە وەرگرن.

(ش): ئەم حەدیسە مەنسوخە بە ئیجماع لای روافـض نـەبێ (واتـە ئـەم حەدیسـە کـاری پێناکرێ لەسەر ڕای گشتی هەموو زاناکانی شەریعەتی ئیسلام و یارانی پێغەمبەر لەلایەن ئەو کەسانە نەبێ کە بەرهەڵستی ڕای ئەهلی سونەت دەکەن).. ئەم مارەکردنی موتعە حەرامە. لە جەعفەری کوڕی محمد پرسیار کرا لەم نکاحە، گوتی: زینایە.. بیری جۆراوجۆر هەیە لەوەی کـە دەبێ لەم جۆرە ژن مارەکردنە دەبێ حەد دەربکرێ، ئیمامی شافعی ﷺ گوتیتی حەددی لەسەر نییە با بش زانی ئەم.جۆرە نکاح و مارەکردنە پووچ و فاسدە. لەبەر ڕای جۆراوجـۆری زانایـان شوبهە هەیە، بەڵام مارەیی و نەسەب و عیدە سابت دەبێ.. لـە حاشـیەی ئەبوسـعود لەسـەر پەرتووکی (کنز) لای ئیمامی حەنەفیش حەدد و ڕەجمی لەسەر نییە.

١١٤٦: عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ فَقَالَتْ إِنِّي وَهَبْتُ مِنْ نَفْسِي فَقَامَتْ طَوِيلاً فَقَالَ رَجُلٌ زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَـــةٌ قَالَ هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا قَالَ مَا عِنْدِي إِلاَّ إِزَارِي فَقَالَ إِذْهَبْ فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًـــا مِنْ حَدِيدٍ، وَمَا تَصنَع بِإِزَارِكَ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شيْءٌ، ماذا مَعَكَ مِـــنَ الْقُـــرْآنِ؟ مَلَكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، وفِي رواية قَدْ زَوَّجتكهَا عند الأكثر.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ئـەنصاریﷺ گوتـی: ژنێـك خـۆی بـە هبـە پێشکەشی پێغەمبەرﷺ کرد، بەم تەرزە گوتی: بمکـە بـە یـەکێك لـە دایکـانی ئیمـانداران.. پیاوێك لەو ئەنجومەنە بێهەوەسی پێغەمبەری هەست پێکرد لە قبووڵ کردنـی، پـێی گـوت: ئەی پێغەمبەری خودا، لە منی مارە بکە.. پێغەمبەر فەرمووی: چیت لایە بیکەیە صـداق و مارەیی؟ گوتی: هیچم لا نییە، فەرمووی: بچۆ لای کەس و ئەهلی خـۆت شـتێکی بـۆ پـەیدا بکە، با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ. پیاوەکە ڕۆیی و هاتەوە، گوتی: واللە هیچم پێ پـەیدا نەبوو، هەتا ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش، بەڵام ئەم پەشتەماڵەی ئیحرامم هەیە کـە خـۆم پـێ داپۆشیوە، بەم تەرزە لـە پشـتم هـەتا چۆکمـی داپۆشـیوە، نیـوەی دەدەمـێ. پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: چی لە پەشتەماڵی تۆ بکا، ئەگەر تۆ لەبەری بکەی بۆ ئەو هیـچ نامێنـێ، ئەگـەر ئەویش لەبەری بکا بۆ تۆ هیچ نامێنێ سـتری عـەورەتی پـێ بکـەی.. پیاوەکـەش دانیشـت،

درێژەی دایێ، لەپاشان هەڵستا، پێغەمبەرﷺ تەماشایێکی کرد، فەرمووی: بگەڕێوە، فەرمووی: لە قورئان چیت لا هەیە؟ گوتی: فلاّن سورەت و فلاّن سورەت و فلاّن سورەت، هەڵیژمارد چەند سورەتێك، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕۆ ئەواتەمکین-ی تۆم کرد (یەعنی خستمە ژێر دەسەڵات و بەکارهێنانی تۆ لەباتی ئەم میقدار قورئانەی لەبەرتە فێری بکەی.. لە ریوایەتێکی تریش فەرمووی: ئەوا تەملیکی تۆم کرد، لە ریوایەتێکی تریش فەرمووی: ئەوا لەتۆم مارە کرد(تەزویج).

بەشی زۆری زانایان لەسەر ئەم ریوایەتەی دوایییەن، بۆیێ ئیمامی شافعی فەرموویتی: ژن مارەکردن بە لەفظی تەزویج و لەفظی نکاح نەبێ مارەیی نابێ. بەلاّم ئیمامی حەنەفی گوتیتی: لەسەر ریوایەتی تەملیك و تەمکین بە صیغەی تەملیکیش ڕاستە(صەحیحە).

پاشان بە گێڕانی فێرکردنی قورئانیش بە مارەیی بۆ ژنان ڕای جۆراوجۆر هەیە، بەم تەرزە ئیمامی شافعی گوتیتی: چونکە فێرکردنی قورئان سوودێکە بۆ لای ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە، کارێکە مرۆڤ بە جەستە ئەنجامی دەداو پێویست بۆ کرێیە، نکاحی پێ دروستە، ئیمامی حەنەفیش فەرموویتی: ئەگەرچی نکاحەکەی ڕاستە(صحیحە) بەلاّم (مهر المثل)ی دەکەوێ، واتا ئەو مارەیی‌یەی کە ژنەکانی ئاوقەرانی ئەو ژنە لەسەر مارەکراوون، وەکو دایکی و خوشکی و پلکی، ئەمانە مارەیی‌یان چەندە، بۆ ئەویش هەمان مارەیی دادەنرێ، ئیمامی حەنەفیش فەرموویتی: چونکی فێرکردنی قورئان ماڵ نیە، شارعیش (واتە ئەوەی شەرعی داناوە) ویستنی نکاحی بە ماڵ داناوە بە فەرموودەی خۆی (أن تبتغوا بأموالکم). ئنجا ئیمامی شافعی چونکی فێرکردنی قورئانی کردووەتە ئیشێك کە بە لەشی ئادەمیزاد پێك دێ بە ماڵی داناوە، حەنەفیش گوتیتی: ماڵ نی‌یە.

**١١٤٧: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ.**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەرضي الله عنه پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مارەناکرێ بێوەژن، ئنجا چی تەلاّق درابێ یا مێردی مردبێ بە مارەکردنێکی ڕاست(صحیح) یا ناڕاست (فاسد) یا بە زینا یا بە ئەنگوست، یا بە شبهە بەکارەتی نەمابێ، هەتا داوای ئەوە نەکرێ کە ژنەکە بەخۆی فەرمان بکا بە مارەکردنی وە بە قسەش داوای نەکا.. وە کچیش مارە ناکرێ هەتا داوای ئیزنی لێنەکرێ.. پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیزنی کچ چلۆنە؟ فەرمووی: لە وەڵامی پرس پێکردنی قسەنەکردنیەتی.

(ش): ئیمامەکان دەربارەی ئەمە قسەی جۆراوجۆریان هەیە. لای مالکیەکان ئەگەر لەگەڵ قسەنەکردن بەڵگەو قەرینەی کراهەت(زۆرلیکردن) هەبێ یان بەدیارکەوت، مارە ناکرێ.. لای شافعیەکانیش بەدیارکەوتنی بەڵگەی زۆرلیکردن تەئسیری نییە، ئیلا مەگەر لەگەڵ گریانەکەی هاوارهاوار هەبێ.

١١٤٨: عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي؟ قَالَ: رِضَاهَا صَمْتُهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لێڕازی بێ) گوتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! بە یەقین کچ شەرم دەکا بۆ مارەکردن ڕەزامەندی خۆی ئاشکرا بکا؟ فەرمووی: ڕازیبوونی کچ قسەنەکردنیەتی.

بۆ زانایان لەم جێگایە قسەی جیاجیا هەیە، بەشێوەیەکی دووروودرێژ، بەرێك کەوتنی هەموویان لەسەر ئەوەی کە دروست نییە مارەکردنی بێوەژنی عاقڵەو بالغە، واتە ژنێك کە عاقڵ بێ و تەمەنی تەواو بێ، بە ئیزنی ئاشکرای خۆی نەبێ.. کچی گچکەش بە رێك کەوتن لەلایەن هەموویانەوە باوکی مارەی دەکا.

بەڵام بێوەژنێ کە هێشتا تەمەنی تەواو نەبێ ڕای جۆراوجۆر هەیە، لای مالك و ئەبوحەنیفە باوکی مارەی دەکا وەکو کچ، لای ئیمامی شافعی و ئەبویوسف و محمد(خوا لێیان ڕازیبێ) باوك پێی مارە ناکرێ، ئیلا مەگەر کچێنی نەمابێ بە چوونەلای-واتە جووت بوون- نەك بە ڕێگایەکی تر، چونکە لە ژنێك کە چوونە لای و لەگەڵی جووت بوون(موطوئة)ی بێوەژن با گچکەش بێ ئەو حەیایەی کە لە کچ دا هەیە نامێنێ. بەڵام کچێك کە کەس نەچووبێتە لای، تەمەنیشی تەواو بێ، باوك مارەی دەکا، لەپاش ئەو ئەولیای تریش مارەیدەکەن..

پاشان لە ئیزن خواستنەوەی کچێك کە کچێنی مابێ تەمەنیشی تەواو بێ ڕای جۆراوجۆر هەیە، حەدیس دەلالەت دەکا کە زۆرکردن بۆ باوك نییە لەسەر کچێك کە کچێنی مابێ و تەمەنی تەواو بێ کە نەیەوێ مارەبکرێ مارەی بکا، ئەمە مەزهەبی ئیمامی حەنەفیە. لای ئیمامی مالك و شافعی و ئەحمەد مارەی دەکا بەڵام بەو مەرجە دیارکراوانەی کە شافعی دیاری کردووە بە بەڵگەی اعتباری مەفهومی مخالف لە حەدیسی (الثَّيِّبُ أَحَقُّ بنفسها مِن وَلِيِّها) چونکە ئەمە بە اعتباری مەفهوم (واتە دەگەیەنی ئەم حەدیسە) کە وەلی کچێ کە کچێنی مابێ زیاتر خاوەن مافەو لێوەشاوەترە لەمارەکردنی. ئیمامی شافیعی باپیریشی وەکو باوك حساب کردووە داینــاوە بە وەلی. ئیمامی حەنەفی گوتیتی: هەموو خاوەنێك(وەلی)

کچێکی پێ مارەدەکرێ کە بێوەژن بێ و تەمەنی بچووك بێ. پاشان ئەم کچە وەکو تەمەنی گەورەبوو بۆی هەیە ئەم مارەکردنە قبوڵ بکا یان نەکا. لای ئیمامی مالك لە مارەکردنی بێوەژنێك کە تەمەنی بچووك بێ وەصی وەکو باوك وایە نەك (وەلیەکانیتر)، چونکە باوك وەصی تەعین کردووە لەجێگای خۆی.. حەنبەلیەکانیش گوتوویانە: بۆ باوك هەیە زۆر لە کچ بکا لە مارەکردن لە هەموو ئەو کیژانەی کە کچێنیان مابێ، بەڵام ئەگەر لەتەمەنی کەمتر لە نۆ ساڵە مارەکرابن بۆ کچەکان هەیە هەڵبژێرن کە گەورەبوون بیانەوێ ئەم مارەکردنە قبوڵ دەکەن وە ئەگەر نەیانەوێ دەتوانن قبووڵی نەکەن. بەڵام ئەگەر نۆساڵ زیاتر بێ تەمەنەکانیان یان لە نۆساڵە مارەکرابن، بۆیان نیيە ئەم مارەکردنە قبووڵ نەکەن.

١١٤٩: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَفْحَتَهَا فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ فەرمووی: حەڵاڵ نیيە بۆ هیچ ئافرەتێك لە پیاوێك داوای تەڵاق دانی ژنی خۆی لیبکا کە خوشکی خۆیشی بێ لە ڕەچەڵەك(نەسەب) یا لە ئاین یا لە شیری بۆ ئەوەی قاپ و قاچاغی ژنی پیاوەکە بەتاڵ بێ لە خواردنەکانی پیاوەکە بۆ ئافرەتەکەی کە داوا دەکا بێنێتەوە. (یەعنی ژنەکەی خۆی تەڵاق بدا ئەو شووی پی بکا). چونکی بۆ ئەو ئافرەتەی داوای تەڵاق دانی خوشکەکەی دەکا هەر ئەمەندە هەیە کە لەسەرەتاوە لە ئەزەل بۆی داندراوەو تەقدیر کراوە.

(ش): حەنبەلیەکان گوتویانە: ئەگەر پیاوەکە مەرجیکرد بۆ ئافرەتەکە هەوێیەکەی تەڵاق بدا مارەکردنەکە ڕاستە، لای هەندێکانیش کە (ئەظهەرە) نادروستەو ناصەحیحە. کۆمەڵێك ئەمەیان هەڵبژاردووە مارەکردنی ئافرەتێك بەشەرتی تەڵاقدانی ژنی خۆی لای ئەظهەری قسەی ئیمامی ئەحمەد ڕاست نیيە، لای ئیمامی شافعی ڕاستە بە مارەیی وێك چوو(مهر المثل) مەرجەکە هیچ نیيە، بەجێ بگەیەنێ یا بەجێی نەگەیەنێ.

ئنجا لەسەر قسەی ئەوانەی کە دەڵێن مارەکردنەکە ڕاستە ئەگەر قسەی خۆی بەجێ نەگەیاند لە تەڵاق دانی ژنی خۆی ئافرەتەکە بۆی هەیە فەسخی مارەکردن و نکاحی خۆی بکا.

١١٥٠: عَنْ عَائِشَةَ، قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ. فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمُ اللَّهْوُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لێ ڕازی بێ) کە عائشە خۆی کچەتیوێکی بێ باوکی هەبوو، دایە پیاوێکی ئەنصاری و پێی بەخشی. لە پەرتووکی (أسد الغابة) دەڵێ: نێوی فارغە بوو، کچی ئەسعەدی زرارە بوو، پیاوەکەیش نێوی نبط بوو کوڕی جابری ئەنصاری.

ئینجا حەزرەتی عائشە خۆی جهازی بۆ کرد وە بۆشی گواستەوە، پاشان وەکوو گەڕاوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عائشە لە ئەسبابی گەمەو دڵ خۆشکەری موباح و حەڵاڵ چیتان بۆ کرد(وەکو دەفە) چونکی خەڵکی مەدینە ئەسبابی خۆشی و دڵخۆشکەریان پێخۆشە.. بۆچی جاریەکت لەگەڵ نەنارد دەفەی لێبدایەو شیعری بۆ بخوێندایەوە.. عائشە فەرمووی: منیش پێم گوت: چی بخوێندبایەوە: فەرمووی بیگوتایە:

(أتيناكم أتيناكم، فحيّانا وحيّاكم ولولا الحنطة السّمرا، ما سَمِنَتْ فتياكم)

واتاکەی: بۆتان هاتین، بۆتان هاتین، سەلام لە ئێمەو سەلام لە ئێوە.. ئەگەر گەنمەبۆر نەبوایە لاوەکانتان قەڵەو نەدەبوون.

منیش دەڵێم: اللهم صلّ على صاحب الخُلق العظيم والقلب الرحيم والنور الجسيم محمد وعلى آله أجمعين.

واتاکەی: دانەری ئەم پەرتووکە دەڵێ: خودایە بڕێژە ڕەحمەت لەسەر خاوەنی ڕەووشتی بەرز و گەورەو دڵی بەمیهرەبانی ڕۆناکی گەورە، کە ئەویش محمدەو خودایە ڕەحمەت بڕێژیتە سەر خزم و کەس و یارانی ئەو.

جا بیر لە ڕەوشتی شیرینی ئەم پێغەمبەرە بکە بە خۆی و خێزانە بەڕێزەکەی خۆی بۆ کچێکی نۆکەری ماڵی خۆیان و هەژارێکی ئەنصاری چی بەزەیی و ڕێزگرتن و میهرەبانیەکیان پیشان دا و چی شەرعێکیشیان بۆ ئێمە جێهێشت.

١١٥١: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَقُولُ حِينَ يَأْتِي أَهْلَهُ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ بَيْنَهُمَا فِي ذَلِكَ أَوْ قُضِيَ وَلَدٌ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عەباسﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ها ئاگادار بە ئەگەر یەکێك لە ئیسلام بە مەبەستی جووت بوون کە دەچێ بۆ لای خێزانی خۆی بڵێ: ئەی خودایە من بپارێز لە شەیتان وە شەیتانیش لادە لەو منداڵەی کە بەئێمەی دەبەخشی.. پاشان خودا دابنابێ لەو جووت بوونە یا حوکمی کردبێ بەبوونی منداڵێك، شەیتان بە قەتعی بە

هەڵخەڵەتاندن و فەریب دان زەرەر بەو منالە ناگەینی.

١١٥٢: عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عومەرﷺ پێغەمبەرﷺ وەکو یەکێکتان بانگ کرا بۆ سەر شیوی بووك با بۆی بچێ.

(ش): فەرمان ئەگەرچی بۆ پێویستە(وجوبە)، هەروەکو جمهوری عێراقیان گوتویانە، چوونە سەر هەر داوەتێك پاشی بانگ کردن واجبە، بەڵام مالکی و حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان کۆمەڵی شافعی گوتویانە: لە بانگی سەر شیوی ژن گواستنەوە نەبێ بەجێگەیاندنی هیچ داوەتێك واجب نییە، بەجێگەیاندنی داوەتەکانی تر سونەتە.

١١٥٣: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلا يُؤْذِي جَارَهُ، وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاهُ فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك باوەڕێکی تەواوی بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەبێ، با جیرانی خۆی ئەزیەت نەدا (نزیکترینی جیرانانیش ئەو دوو مەلائیکە(فریشتە)ن کە نووسەرن بۆ چاکە و خراپە، بە کردنی گوناهانیش با ئەوانیش ئەزیەت نەدا).. وە داوای فەرمانی منیش بکەن دەرحەق بە ژنان (واتا من ئەمرتان پێدەکەم دەرحەق بە ژنان باش بن و قبولی وەسیەتی من بکەن) چونکی ئافرەت دروست کراون لە پەراسوان، وە خوارترینی بەشەکانی پەراسووش لایی سەرەوەیتی، ئنجا ئەگەر پەراسوو ڕاست بکەیەوە دەیشکێنی، وە ئەگەر هەر لەسەر خواریەکەی خۆی وازی لێبێنی و ئیدارەی لەگەڵ بکەی، سوودی لێ وەردەگری.. ئنجا من ئەمرتان پێدەکەم دەرحەق بە ژنان باش بن (چونکی مادام بەشی سەرەوەی ئەصلەکەیان کە خواریێ ئنجا کە ژنیش لەم خواریە دروست کراو بێ خواریەکە سروشتییە شتی سروشتیش قابلی گۆڕان نییە).

١١٥٤: عَن عائشة رضي الله عنها، كنت لك كأبي زرع لأمي زرع، حديث أمّ زرع مشهورة تركناه ولعدم رفعه الى النبي صلى الله عليم وسلم أيضاً من عائشة.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە خوای لیّڕازی بێ گوتی: ئیفتخار و شانازیم کرد بـە مـاڵ و دەوڵەمەندی باوکم لە زەمانی جاهلیەت هەزارهەزار وەقیە زێڕی هـەبوو یـەعنی (ملیۆنێـك).
پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەی عائشە قسە مەکە، من بـۆ تـۆ لـەخصوص چاکـەو باشـیم دەرحەق بە تۆ، وەکو ئەبوزەرع دەرحەق بە ئومی زەرع، لە گێڕانەوەیەکیتر بە زیادی فەرمووی: بەڵگی باشتریشم، چونکی ئەبوزەرع ئومی زەرعی تەڵاق دا، من تۆ تەڵاق نادەم (عائشە گوتی: دایك و باوکم بە قوربانت بێ تۆ باشتری لە ئەبوزەرع.)
حەدیسی ئومی زەرعیشم لەبەر دوو شت نەنووسی، یەکییان زۆر درێژ بوو، دووەم حەزرەتی عائشە رەفعی نەکردووە کە بڵی پێغەمبەرﷺ وای فەرموو.

١١٥٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ وَلا تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەرضي الله عنه پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەڵاڵ نییـە بـۆ ئـافرەتی بـەمێرد ڕۆژووی سونەت بگرێ مێردیشی مەوجودو حازر بـێ بـە ئـیزنی مێردەکـەی نـەبێ. وە نابـێ ئیزنیش بدا هیچ کەسێك بێتە ژووری بە ئـیزنی مێردەکـەی نـەبێ، وە بـەبێ ئـەمری مـێردی هەرچی خەرجیش دەکا بەخێر لەماڵی مێردی، نیوەی پاداشتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێردەکەی.
(ش): ئەمە دەلالەت دەکا حەرامە بۆ ژنی بەمێردی ساغ و نامادە(مـەوجود) بـێ ئـیزنی مێردەکەی ڕۆژوی سونەت بگرێ لای جمهور ئەگەرچی نەوەوی لە مەجموع گوتیتـی ئـەصحابی ئێمە گوتویانە مەکروهە(پەسند نییە)، بەڵام ڕاستەکەی قسەی جمهورە. بەڵگەیان هێناوەتـەوە هەندێ لە مالکیەکان بەم حەدیسە بۆ مەزهەبی خۆیـان کـە گێڕانـەوەی ڕۆژوو واجبـە لەسـەر کەسێك ڕۆژووی تطوع بشکێنێ بە ئەنقەسـت، چونکـی ئەگـەر بـۆ پیاوەکـە هـەبێ تێکدانـی ڕۆژووی ژنەکەی بە جووت بوون، ژنەکە پێویستی بە ئیزنی پیاوەکە ناکا، وە ئەگـەر تێکدانـی ڕۆژووەکەش بە بەتاڵ کردنەوەی بە جووت بوون لەگـەڵیان ئـیزنی پیاوەکـە هیـچ مەعنایـەکی نییە، مادام بەتاڵ کردنەوەی ڕۆژوو بۆ مێرد حەرامە، شکاندنیشی بە عەمد و ئەنقەست قەزای دەوێ.. مالکی دەڵێت بە دەلیلی ئەم حەدیسە واجبە قەزای ڕۆژوی سـونەت ئەگـەر بـێعوزر بیشکێنی.

١١٥٦: عَنْ أُسَامَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَكَانَ عَامَّةَ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ وَأَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: شەوی میعراج، یا لەخەو ڕاوەستام لەسەر دەروازەی بەهەشت، دیتم بە عمومی (بەشێوەیەکی گشتی) ئەوانەی کە چوونە نێو بەهەشت هەژارەکانی ئیماندار بوون، خاوەنی سامان و دەوڵەمەندەکانیش لەپێش دەروازەی بەهەشت بە بەندکراوی ڕاگیرابوون، بەڵام ئەهلی ئاگر لەپاش حساب فەرمانیان بۆ دەرچوو بۆ ئاگر چوون.. لەسەر دەرگەی ئاگریش ڕاوەستام، دیتم بەشێوەیەکی گشتی ئەوانەی چوونە نێو ئاگر طائفەی ژنان بوون.

(ش): لەبەر غەلەبەی ئارەزووی نەفسانیەیان جوولانەوەیان بەپێچەوانەی فەرمانەکان کردنی ئەو کارانەی نەهی‌یان لی‌کراوە دیارکەوت بەشی زۆری ئەهلی بەهەشت هەژارەکانن وە بەشی زۆری ئەهلی ئاگریش ژنن.

١١٥٧: عَنْ أَسْمَاءَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەسمای کچی حەزرەتی صدیق (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: خۆم بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ پێغەمبەر کرد وەکو ئەوەی لەوێ نەبێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! ئافرەتێك هەوێی هەیە، ئەگەر شانازی بە شتێك بکا لەسەر هەوێیەکەی، گۆیان ئەم شتە مێردم بە منی داوە، کەچی پێشی نەدابێ، ئایا گوناهی دەگاتێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆهەڵکێش بە شتێك کە پێی نەدرابێ وەکو کەسێکە دوو جلکی ساختەی لەبەر بێ.. یەعنی جلکی خۆی نەبێ بۆ خۆ جوانکردن خواستبێتیەوە، واتە ئەو کەسەی جلکەکەی داوەتێ و ئەوەی دەبەری کردووە هەردوویان درۆزنن.

١١٥٨: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە غیرەت دەنوێنێ،

غیرەت بە مەعنا ڕقبوونەوەیە لەسەر بەشداربونی خەڵکی تر لەو کاروبارانەی تایبەتە(موختەصە) بەخۆی، ڕق بوونەوەو تۆڵەی خودای گەورەش لەبەر ئەوەیە کە پیاوی ئیماندار ئەو شتە دەکا کە خودا حەرامی کردووە.

١١٥٩: عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: لَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِخْ إِخْ قاله لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسِيرَ مَعَ الرِّجَالِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەسمائەی کچی ئەبوبەکر(خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: زوبەیری کوڕی عەوام منی لە مەکە مارەکرد، نەیبوو لە عارد هیچ ماڵێك، وەکو ووشتر و زەوی بۆ کشتوکاڵ، وەکوو بەندەو جاریە، تەنیا ووشترێك بۆ ئاوکێشان، ئەسپێکیش بۆ سواری هەبوو. منیش ئاوم بۆ دەکێشا و ئەسپەکەم بۆ ئاودەدا، وە دەولکی ئاوم بۆ دەدوریەوە وە هەویریشم دەکرد، بەڵام باش نەم دەزانی نان بکەم، هەندێ ژنی-ئەنصاری-جیرانمان هەبوو، منیان خۆش دەویست، نانەکەیان بۆ دەکردم.. بۆ ئالیکی ئەسپەکەش دوو میل ڕێگا (یەعنی هەشت هەزار شەقاو) دەڕۆیشتم ناوکە خورمام دەهێناوە، لەباخچە خورمایەکی بەنی نەضیر کە پێغەمبەرﷺ لەماڵی-فەیء- واتە غەنائم و دەسکەوت بە زوبەیری دابوو، ڕۆژێك لە باخچەکە هاتمەوە، ناوکە خورمایەکانم لەسەر سەر بوو، لەڕێگا گەیشتمە پێغەمبەرﷺ، کۆمەڵێکی ئەصحابیشی لەگەڵ بوو لە ئەنصاریەکان، بانگی کردم، پاشان بۆ یخ کردنی ووشترەکەی خۆی فەرمووی: أخ أخ، هەتا لەپاش خۆی سوارم بکا، منیش شەرمم کرد لەگەڵ پیاوان بڕۆم، خەیاڵی غیرەتی زوبەیریشم کرد کە لە خەڵکیتر بە غیرەت ترە، پێغەمبەریشﷺ زانی شەرم دەکەم وازی لێ هێنام و ڕۆیشت.. ئنجا وەکوو هاتنەوە، چیرۆکەکەم بۆ زوبیر گێڕاوە، گوتی: واللە هەڵگرتنی ناوکەخورمایەکانم پێ ناخۆشتر بوو لە سواربوونت لەپاش پێغەمبەرﷺ، ئەسمائە گوتی: ئنجا لەم مەشەقەت و ماندوبوونە ڕزگارم هەر نەبوو، هەتا ئەبوبەکر نۆکەرێکی بۆ ناردم، خزمەتی ئەسپەکەی لەیەقە کردمەوە، گۆیا جاریەك بووم ئازادی کردم.

١١٦٠: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى، قَالَتْ: فَقُلْتُ مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ لا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى قُلْتِ لا وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ، قَالَتْ: قُلْتُ أَجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: من حاڵی تۆ دەزانم وەکوو لە من ڕازی بی، حاڵی ڕق بوونەوەشت لەمن دەزانم، منیش پێم گوت: لەکوێ ئەمە دەزانی؟ فەرمووی: وەکوو لەمن ڕازی بی تۆ دەڵێی نە بە خودایی محمد، وەکو لە منیش ناقایل بی دەڵێی نا بە خودای ئیبراهیم.. پێم گوت: ڕاست ئەکەی، فەرمایشتی تۆیە، واللە ئەی پێغەمبەری خودا، لەبەر زۆر خۆشەویستنم دەرحەق بەتۆ تەرك ناكەم لەنێو دڵی خۆم تەنیا ناوەدیارەکەت نەبێ بەزمان.. ناوەکەی تریش دەگۆڕم بە ئیبراهیم کە بە اعتباری ظاهر و باطن نزیکترین خەلکیتری لە ئەو وەکو ئایەتی مەجیدەو پیرۆز دەفەرموێ (إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ) کە محمدە، یەعنی لە حاڵی تووڕەبوونیش دڵم لەتۆ جودا نابێتەوە هەروەکو شاعیر گۆتەنی:

(انّی لأمنحك الصّدود وانّني قـسَماً إليك مع الصدود لأميل)

١١٦١: عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: الْحَمْوُ الْمَوْتُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عەقبەی کوڕی عامری جوهنی ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەکەن بچنە لای ئافرەتان بە تەنیا بێ مەحرەم لە خانوێکدا بن.. پاشان پیاوێك لە ئەنصار پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا، خەبەرمان پێ بدە دەرحەق بە خزمی مێرد، غەیری باوك و ئەولاد وەکو براو برازاو ئامۆزا، حوکم چلۆنە؟ فەرمووی: خزمی مێرد مردنە، یەعنی گەیشتنی خزمی مێرد بە ئافرەت وەکو گەیشتنی مردنە، چونکی یا هیلاك و لەناچوونی دینی تیایە، یا لەناوچوونی ڕووحی تیایە لەبەر جودابوونەوەی لەمێردی کە غیرەتی قبووڵی نەکرد تەڵاقیدا.

١١٦٢: عَن ابن مسعود، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە کوڕی موسعود ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با ئافرەتێك نەچێتە لای ئافرەتێك لە یەك لباس، پاشان وەصفیشی بکا بۆ مێردەکەی خۆی بە تەرزێکی وا گۆیا مێردەکەی ئەماشای دەکا، بەم تەرزە بڵێ ئەمەندە قەڵەوەو بەژن و باڵای وایەو چاوی وایە، چونکی ئەمە فەریب دانی مێردەکەیەتی بۆ ژنی بێگانە.

١١٦٣: عن جَابرَ بْنَ عَبْدِاللّٰهِ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَطَـالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ فَلا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً.. وعنه أيضاً: قَالَ إِذَا دَخَلْتَ لَيْلاً فَلا تَدْخُلْ عَلَى أَهْلِكَ حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ وَتَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللە ی ئەنصاری ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: وەکـو یەکێکتان تووشی سەفەرێکی درێژ بوو، پاشان وەکو گەڕاوە، بـا بەشـەو نەچێتـە لای ئـەهل و عائلەی(خێزانی) خۆی، چونکی خۆپاك کردنەوەو ڕازاندنەوەی ئافرەت بۆ پیاوی خۆی کـارێکی شەرعی و بەجێیە. خێزانیش لەم کارە شەرعیە بێئاگایە، بۆیێ دیسان لە جابـیر دەگێڕنـەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویتی: وەکو بەشەو چوویە ناو شار، لە عەینی شەو مەچووە لای خـێزانت، هەتا مووەکانی پیسی لادەباو پرچەکانی گرژ و شێوای شەدەکا.

## کتاب الطلاق

## باسی بەردان( تەلاق دان )

١١٦٤: عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللّٰهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی حەزرەتی عومەر ﷺ خێزانی خۆی کە ئامنەی کچی غیفار بوو لە حەیزدا بوو تەلاقی دا، حەزرەتی عومەریش لەم تەلاق دانە پرسیاری کـرد لـە پێغەمبـەر ﷺ، پێغەمبەر فەرمووی: فەرمانی پێ بکە بێهێنێتەوە ژێر نکاحی خۆی، پاشان با دەوام بکا لەژێر نکاحی هەتا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیز پاشان پاك دەبێتەوە، پاشان ئەگەر هەوەسی هێنا با هەر لەژێر نکاحی ئەو دەوام بکا. وە ئەگەر هەوەسیشی هێنا لە پاك بوونـەوەی پاشـی لەپێش جووت بوون(جماع) با تەلاقی بدا، ئنجا ئەم پاك بوونەوانەیـە ئـەو عیـدەی کـە خـودا فەرمانی کردووە ژنیان تیا تەلاق بدرێ، بـەم تـەرزە فـەرموویتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَـاتُ يَـتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾ یەعنی لەم حەدیسە پیرۆزە ئاشکرا بوو مەبەست و موراد لە قروء کـە عیدەی تەلاقی ئافرەتە سێ پاك بوونەوەی پاش تەلاق درانە، مەبەستیش لە عیدە لـە ئایـەتی (فطلقوهنَّ لعدتهن) چاك بوونەوەیە، لامی (لعدتهن)یش بۆ کات دیارکردنـە، یـەعنی لـەکاتی پاك بوونەوەیان تەلاقیان بدەن، ئەمە تەلاقی سونیە، تـەلاقی کـوڕی عومـەر ﷺ چونکـی لـە حەیزدا بوو بدعی بوو.

١١٦٥: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ الْحَقِي بِأَهْلِكِ، قَالَه لابْنَةِ الْجَوْنِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە(خوای لیٚ ڕازیبیٚ) گوتی: وەکو نعمانی کوڕی جونـی کنـدی عەرزی پێغەمبەری کرد کە کچەکەی لەخۆی مارە بکـا، لەپاشـان باوکەکـەی بەخۆیشـی بـۆ پێغەمبەری ڕەوانەکرد، پێغەمبەریشﷺ لیٚی بەنزیك کەوت، کچەکە چونکـی لـە ئـەزەل لـە ئەهلی شەقاوەت بوو، گوتی بەخودا خۆم لەتۆ دەپارێزم. پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: بـەزاتێکی گەورە خۆت لە من پارازت، بچۆوە ماڵی باوك و کەسەکانی خۆت.

(ش): ئەمە کنایەتە لە تەڵاق، ئەگەر موورادی تـەڵاق دان بوویـیٚ بـەڕای هـەموو لایـەك، ئەگەرنا ناکەویٚ.

١١٦٦: عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَبِي نَفْسَكِ لِي، قَدْ عُذْتِ بِمَعَاذٍ، يَا أَبَا أُسَيْدٍ إِكْسِهَا رَازِقِيِين وَأَلْحِقْهَا بِأَهْلِهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنـەوە لـە ئەبوئوسـەیدﷺ گوتـی: نـەعمانی کـوڕی جـەونی کنـدی هاتـە خزمـەت پێغەمبەرﷺ کە یەکێك بوو لـە میرەکـانی عەرەبسـتانی وواڵتـی یەمـەن، پـیٚی گـوت: زۆر حەزدەکەم ئومیمەی کچی خۆمت لیٚ مـارە بکـەم، کـە شـیرین و لاوچـاك ترینـی کچـەکانی عەرەبستانە، پێغەمبەریشﷺ مارەی کرد، ئەبوئوسەیدی ساعدی لەگـەڵ هـەنارد، ئومەیـەی کچی نەعمانی جەونی گوێزتەوە لەنێو هۆزی بەنی ساعیدەی دابەزاند، کچەکانی بەنی ساعیدە هاتنەلای کەیف خۆشی خۆیان نیشان دا، باسی جوانی ئەویان دەکرد لەنێو خۆیـان، پێغەمبـەر بۆ لای کچەکە تەشریفی فەرموو، فەرمووی خۆت هبەی من بکە (واتە خۆت بە من ببەخشە)، بۆ دڵدانەوەو دڵخۆش کردنی کچەکە وای فـەرموو، ئەگـەرنا بـۆ پێغەمبـەرﷺ دروست بـوو لەخۆی مارە بکا بەبیٚ ئیزنی ژنەکەو بەبیٚ ئیزنی باوکی، چونکی تەنیا ڕەغبەتی پێغەمبەرﷺ کافی بوو بۆ صحەتی نکاح)، کچەکەیش گوتی: قەت مەلیکە-واتا شاژن-نەفسـی خـۆی بـە کرمانجی خۆی دەبەخشیٚ؟ پێغەمبەریش دەستی پیرۆزی خۆی بلند کرد بۆ ساکن بـوون و ئـارام کردنەوە بەسەریدابێنیٚ، گوتی: بەخودا خۆم دەپارێزم ، پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: بـە حـافظ و مەعاذێکی گەورە خۆت پاراست. لەلای ژنەکە هاتە دەریٚ، فەرمووی: ئەی ئەبو ئوسـەید، دوو ڕازقیەی لەبەر بکە(ڕازقیە کەتانێکی زۆر فـاخر و نایابـە و سـپیـیە) بیبـەوە مـاڵی بـاوکی، هەروەکوو تۆش هێنات.

(ش) کچەکە لەم قسەی کردی زۆر پەشیمان بۆوە، ئەما سوودی بۆ نەدا، چونکی لای وابوو

ئەگەر ئەم قسەیە بکا خۆشەویست تر دەبێ، کەچی نەیزانی لەبەر سەبقەتی قەڵەمی ئەزەلی بە کفری ماڵی دونیاو قیامەتی کۆر بۆوە (واتا: لە ئەزەل ئەم ژنە روحی بەکافری دروست کرابوو).

**١١٦٧: عَنِ عَائِشَةَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لاَ حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ.**

**(تەرجەمە)**

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە(خوای لێ‌ڕازی‌بێ) گوتی: تەمیمەی کچی وەهبی ژنی ریفاعەی قورەیظی (یەعنی لەهۆزی قورەیظە بوو) هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ریفاعە بە قەطعێکی کوللی منی-واتا بەتەواوی منی- تەڵاق دا، لەپاش ئەو شوم بە عبدالرحمانی کوڕی زوبێر کردووە، ئالەتەکەی عبدالرحمانیش وەکو رایەلی بێ‌تەوەرێخی ئەترافی لباسە لە شل و خاوی، یەعنی ناتوانی لەگەڵم جووت بێ(جماعی پێ‌ناکرێ).. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ممکنە بتەوێ بگەڕێیەوە لای ریفاعە، کە مێردی پێشووتە، نابێ بگەڕێیەوە لای ئەو هەتا هەنگوینۆکەی تۆ نەچێژێ عبدالرحمان، تۆیش هەنگوینۆکەی ئەو نەچێژی، یەعنی هەتا لەزەتی (جماع) لەیەکتری وەرنەگرن بە بزربوونی گۆی ئالەت یەعنی(حەشفە) نابێ بگەڕێیەوە.

(ش) عبداللەی کوڕی عەباسؓ گوتیتی لە زەمانی پێغەمبەرداﷺ وە لە زەمانی ئەبوبەکر و دوو ساڵیش لە زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عومەر کەسێك بە یەك جار سێ‌بەسێ ژنی خۆی تەڵاق بدایە بە یەك تەڵاق دەژمرا، پاشان عومەر فەرموی: دەبینم خەڵك پەلە دەکەن لە کارێك پێویستی بە لەسەرەخۆیی هەیە بۆ ئەوان لەو کارە، کەوایە منیش لەسەر پەلەکردنەکەی ئەوان پەلەکردنەکەیان دەرِوێنم. لەپاش رواندنی عومەر تەڵاقی سێ‌بەسێ بە یەکجاریش بێ هەرسێ دەکەوێ لای جمهور موتەفەقوعلیهی‌یە-واتە هەموو لایەك لەسەر ئەمە رێك کەوتوون-.. پاشان کۆکردنەوەی هەرسێ تەڵاق بە یەك جار لە خاوێنی ئافرەت-لای شافعی راستە لەبەر فەرموودەی خودا (**لاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ**)(**إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ**) ئەمە وادەگەیەنێ کە موباحە(راستە).

لەخمیش لە مالکیەکانە گوتیتی: خستنی دوو تەڵاق مەکروهە(پەسند نی‌یە)، خستنی سێ‌یانیش قەدەغەیە، یەعنی خستنی یەکێك دروستە. وەکو زەمانی پێغەمبەر و ئەصحاب. کە کەلیمەی-وشەی- سێ‌تەڵاقیان بەکار دەهێنا، ئەگەر بشیان کردبایە هەر یەك تەڵاق دەکەوت، لای حەنەفیەکانیش بدعیە یەعنی داهێنانەکە- چونکی تەڵاق بۆیی متعددە هەتا پێی بکرێ ژنەکەی بێنێتەوە، ئەگەر پەشیمان بۆوە، کەوایە حەلاڵ نی‌یە بۆی رێگای گەڕانەوەی

ژنەکەی لەخۆی ببڕێ.

١١٦٨: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عەباس‌ گوتی: جەمیلـەی خوشـکی عبـداللە ی کـوڕی ئوبەی هاتە خزمەت پێغەمبـەر‌ گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ثـابتی کـوڕی قەیسـی ئەنصاری کە مێردی منە، هیچ گلەیی و گازاندەم لێی نی‌یە نە لە دین نە لە ئـەخلاق، بـەڵام زۆرم پێ‌ناخۆشی کفرانی حەقی مێردی خۆم لە دینی ئیسلام (چونکی زۆر ڕقی لە ثابتی مێردی دەبۆوە، هەروەکو عـادەتی ئـافرەتی جـوان و شـیرین وایـە شـۆخی بەسـەر مـێردیدا دەکـا و موعاشرەو ڕابواردنی لەگەڵا ناخۆشە)، پێغەمبەریش‌ فەرمووی: ئەو باخچەی بـە صـداق و مارەیی دابوویە تۆ. دەیدەیەوە، گوتی: بەڵێ، دەیدەمەوە، پێغەمبەر‌ بەلای ڕێ‌نیشاندان نەك بەلای وجوب و بەسەردا سەپاندن فەرمانی بە ثابت کرد باخچەکەی لێ قبووڵ بکە تەڵاقی بدە.

(ش): ئەمە بەڵگەو دەلیلی مەشروعیەتی (خلعە) کە جودابوونەوەی مێردە لە ژنی خۆی بە تۆڵەیەکی (عِوَضْ) بگەڕێتەوە بۆ مێردەکە بە لەفظی (خُلع) یەعنی داڕنین یا بە لەفظی تەڵاق.

١١٦٩: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعبَّاسٍ: يَا عَبَّاسُ أَلا تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا، فَقَالَ: لَوْ رَاجَعْتِهِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تَـأْمُرُنِي؟ قَالَ: إِنَّمَا أَنَا أَشْفَعُ، قَالَتْ: لا حَاجَةَ لِي فِيهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عەباس‌ گوتی: مێردی بەریرەی جاریەی حەزرەتی عائشە نێوی (مغیث) بوو، وەکو حەزرەتی عائشە بەریرەی ئازاد کرد و بوو بە حوڕە فەسخی نکـاحی خۆی لە (مغیث) کرد، (چونکی ئەگەر مێرد بەندە (عەبد) بێ و ژن ئازاد بێ، ئافرەتەکە بـۆی هەیە فەسخی نکاحی بکا، ئنجا عبداللە دەفەرموێ: خۆم تەماشام دەکرد (مغیث) لە شـوێنی بەریرە دەگەڕا، فرمێسکەکانی بەسەر ڕیشـیدا دەڕێشـت. پێغەمبـەریش‌ فـەرمووی: ئـەی عەباس، ئەرێ تۆ سەرت سـوڕ نامێنـێ لـە خۆشەویسـتی (مغیـث) دەرحـەق بـەریرە، وە ڕك بوونەوەی بەریرەش لە (مغیث).. ئەرێ چما نابێ بۆی ببەیەوە، بەریرە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەرێ تۆ فەرمانم پێ دەکەی؟ فەرمووی: فەرمانت پێ ناکەم، بەڵکی بەشێوەی (عدمـی وجوب) تکا دەکەم، بەریرە گوتی: من هیچ پێویستیم بە ئەو نی‌یە.

(ش): لەم حەدیسە زاندرا دروستە تکای حاکم لە خەصمی غالب-واتە لای خاوەن بەڵگەو دەلیل تکا بکا لۆ لای بێ بەڵگەو دەلیل- لەپاش بەدیارکەوتنی حەق و ڕاستی لە مەیدانی موحاکەمەو دادوەری، ئەگەر تکاشی نەگیرا نابێ پێ عاجز بێ، وە ئەگەر پیاوێکی موسوڵمان گرفتاری خۆشەویستی ئافرەتێکی موسوڵمان بوو نابێ عەیبی لێ بگیرێ مادام هیچ کارێکی وای نەکردبێ عەیبی لێ بگیرێ.

١١٧٠: عَنْ سَهْلٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مەن و ڕاوەستاو بە مەسالحی (پەرژەوەندی) هەتیو لە بەهەشت بەینمان وەکو بەینی ئەم دوو ئەنگوستەیە، بە ئەنگوستی شەهادەو ئەنگوستی ناوەند، لەگەڵ نەختێ جودابوونەوە لەبەینیان ئاماژەی(اشارە) فەرموو، یەعنی دەرەجەی هەردوومان لەیەکتر نزیکە.

١١٧١: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: مَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنَّى ذَلِكَ، قَالَ: لَعَلَّهُ نَزَعَهُ عِرْقٌ، قَالَ: فَلَعَلَّ ابْنَكَ هَذَا نَزَعَهُ عِرْقٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: ضەمضەمی کوڕی قەتادە هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا، من تازە کوڕێکم بووە، ڕەشە، منیش سپیم، بەدڵ ڕکم لێ دەبیتەوە، وە ئەترسم لەمن نەبێ.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ ووشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ هەیتم، فەرمووی: ڕەنگیان چیە؟ گوتی: ڕەنگیان سوورە. فەرمووی: هیچ ووشتری بۆریان تیایە؟ گوتی: با، فەرمووی: مادام ڕەنگی ووشترەکانت سوورە، ئەم ڕەنگە شینە ئاسمانیە لەکوێ هات؟ ضەمضەم گوتی: لەوانەیە یەکێك لە باب و باپیری دایڕنیبێ لە ڕەنگی سوور، ڕەنگی بۆری (ڕەمادی) خۆی پێدابی، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: لەوانەیە کوڕەکەی تۆیش یەکێك لە باب باپیرانی دایڕنیبی لە ڕەنگی تۆ کە سپیە، ڕەنگی ڕەشی خۆی پێدابی.

(ش): لەم حەدیسە وەردەگیرێ قەدەغەیە بڵێی ئەمە کوڕی من نیە لەبەر ئەوەی هەندێ نیشانەی زەعیفە، بەڵکی پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی باش بکا. بەم تەرزە ببینی کە ژنەکەی

زینا دەکا، یان منالێکی ببێ بە کەمتر لە شەش مانگی، یا پیاوەکە بە قەطعی (بڕای‌بـڕای) سەرجێیی نەکا.

١١٧٢: عَنِ ابْنَ عُمَرَ ،قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْمُتَلاعِنَيْنِ: حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ لا سبيل لك عليها، قَالَ: مَالِي؟ قَالَ: لا مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْـهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی حەزرەتی عومەرﷺ لە حەدیسی متلاعنین کە عوەیمری عجلانی و ژنەکەی بوو. گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە دوو متلاعنەکان: ژمارەی کـردار و گفتارتـان لەسەر خودایە، لەم تەلاعنەشتان بێشك یەکێکتان درۆزنن، یەعنی پێویستە تۆبە بکـا، هیـچ ڕێگاو دەسەلاتت نی‌یە لەسەر ئەو ژنە، گوتی: ئەدی ئەو ماڵی بە صداقم پێداوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ ماڵت نی‌یە، ئەگەر تۆ لەو نسـبەتی وەپـاڵ ئـەم ئافرەتـەتدا ڕاسـت بـی ئـەوا ماڵەکەت بوو بە تۆڵەی فەرجی ژنەکە کە بە حەلاڵی چەند زەمانە بەکارت هێناوەو تەسەروفت کردووە، وە ئەگەر درۆیشت کردبێ لەسەر زیانی ژنەکە، داواکردنت بۆ ماڵ و صداقەکە، تۆ لـە حەق و عەدالەت دوورتریشی(یەعنی بەدرۆ نسبەتی زیناشـی وەپـاڵ بـدەی لەگـەڵ ئەمـە کـە زۆریشت بەکارهێناوە، ماڵەکەی پێشت داوە لی‌ی بستینی‌یەوە، غەدرە لە ژنەکە.)

(ش): لە (لا سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا) وا دەگەیەنێ کە هەتاهەتایە ئەم ژنە لەم پیاوە حەرام کـرا، یەعنی بەهیچ لایەك لەژیانی دونیات بەهیچ شێوەیەکی شەرعی حەقت نی‌یە سوود لەم ئافرەتە وەربگری.

١١٧٣: عن أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا تَكَحَّلْ، قَـدْ كَـانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَمْكُثُ فِي شَرِّ أَحْلاسِهَا أَوْ شَرِّ بَيْتِهَا، فَإِذَا كَانَ حَوْلٌ فَمَرَّ كَلْبٌ رَمَتْ بِبَعَرَةٍ فَـلا حَتَّى تَمْضِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئومی سەلەمە گوتی: مغیرەی مەخزومی وەفاتی کرد، عاتکەی خێزانەکەیان هێنا خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێیان گوت: ترسمان لەچاوی ئەم ئافرەتە هەیە شتێکی بەسەر بێ، دووجار یان سێجار ئیزنیان خواستەوە لە پێغەمبەرﷺ کە کل لەچاو بکـا، لـە وەڵامـی ئـیزن خواستنەوەیان فەرمووی: نابێ کل لەچاو بکا. بەڕاستی لە زەمانی جاهلیەت ئەگەر یـەکێکتان مێردی بمردایە، دەوامی دەکرد لە خراپترینی جلکەشڕەکانی، یا لە خراپترین خانووی خـۆی بـۆ

ماوەی ساڵێك، ئنجا لەپاش تەواوبوونی ساڵێك چاوەڕێی ڕەت بوونی سەگێکی دەکرد، وەکوو سەگیش ڕەت دەبوو کشپلێکی دەهاویشتێ(گۆیا تازیەڕاگرتنی ساڵێکم وەکوو هاوێشتنی ئەم کشپلە پێ ئاسانە)، ئنجا نابێ کل لەچاو بکا هەتا چوار مانگ و دەڕۆژ نەچێ.

(ش): عیدەی ژنانیش لەپێشدان بەتایبەتی (وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ) ساڵێك بوو، بەڵام بەئایەتی (يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا) نەسخ کرا، ئەم ناسخە ئەگەر چی لە خوێندنی قورئان لەپێشدایە واتا (مقدمە)، بەڵام لە هاتنەخوارەوە درەنگە.

## باب النفقات

## (باسی نەفەقەکان)

١١٧٤: عَنْ أَبِي مَسْعُود عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی سەعی و هاتوچۆدەکا بۆ پەیداکردنی رزقێك کە بیداتە بێوەژن و هەژار، لە پاداشتدا وەکو کەسێکە لە غەزادا لەرێگەی سەرکەوتنی دینی خودا یا وەکو کەسێکە بەشەو هەر لەنوێژدابێ بەرۆژیش هەر بەرۆژوو بێ.. گومان لەم گێرانەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گێرایتی‌یەوە.

## (كتاب الأطعمة)

## باسی خواردنەکان

١١٧٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عُدْ، فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ، ثُمَّ قَالَ: عُدْ، فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ حَتَّى اسْتَوَى بَطْنِي فَصَارَ كَالْقِدْحِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ گوتی: برسی بوونێکی زۆر بەسەرمدا زاڵ بوو(چونکی بەرۆژوو بوو هیچیشی دەست نەکەوت ئیفتاری پێ بکاتەوە، مایەوە بۆ رۆژیتر) ئنجا گوتی: گەیشتمە عومەری کوڕی خەتاب، پێم گوت: ئایەتێکم لە قورئان بۆ بخوێنەوە لە سورەتی (آل عمران) سوودت لێ وەربگرم (یەعنی بەبیرم بینەوە)، حەزرەتی عمر چووە ماڵی خۆی، ئایەتەکەی بە من گوت، منیش نەختێ ڕۆیشتم لە برسان تاقەتم نەما کەوتم، کاتێك دیتم پێغەمبەر ﷺ لە سەرسەرم راوەستاوە، فەرمووی: ئەی ئەباهورەیرە: پێم گوت: لبیك، یەعنی لە

خزمەت ڕاوەستاوم، دەستی گرتم، ڕاستی کردمەوە، هەستی کرد زۆرم برسی یە، بۆ جێگای خۆی تەشریفی کرد، ئەمری فەرموو: کۆتکەشیرێکی گەورەیان بۆ هێنام، خواردمەوە، پاشان فەرمووی: ئەی ئەبوهورەیرە، ئەم جارەیش، ئەم جارەیش شیرەکەم خواردەوە، دیسان فەرمووی: ئەمجارەیش، ئەم جارەش خواردمەوە. خولاصە لەسەر فەرمانی پێغەمبەرﷺ بە سێ جار ئەمەندەم خواردەوە هەتا وورگم ڕاست بۆوە، وەکو باسکەتیری بێ پەڕ ڕاست بووم، هیچ کووڕاییم نەما، پاشان گەیشتمە حەزرەتی عومەر، حیکایەتی زۆر برسی بوونی خۆم بۆ گێڕاوە، و گوتم: خودای گەورە بۆ لابردنی تەووژمی برسیەتیم یەکێکی لەتۆ باشتری لەسەر دانام ئەی عومەر، والله بەڕاستی من داوای خوێندنەوەی ئایەتێکم لەتۆ کرد کە منیش لەتۆ باشترم دەزانی، عومەریش بەرامبەر گازاندەی ئەبوهورەیرە گوتی: تۆم ببردایەوە بۆ خواردن، لە مێگەلێك ووشترم پێ خۆشتر بوو، بەلاّم شتێك کە لەدەست چوو پەشیمانی زیادە.

١١٧٦: عَن عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ لِي رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: يَا غُلامُ سَمِّ اللّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عمری کوڕی ابوسلمە، عبداللەی کوڕی عبدالله الاسدﷺ گوتی: منالّ بووم لەژێر چاوەدێری تۆ و پێغەمبەر دابووم (چونکی دایکی کە ام سلمە بو لەپاش ئەبوسەلەمە بووە یەکێك لە دایکانی ئیمانداران) دەستم لەسەر سینی خواردن پەیڕەوی ئەدەبی نەدەکرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەرێ کوڕە، بڵێ بسم الله الرحمن الرحیم، بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، وە بەدەستی ڕاستیش بخۆ، وە لەپێش خۆیشت بخۆ.. ئنجا لەو کاتەوە خواردنی من بەم تەرزەیە.

(ش): صیغەی ئەمر لە هەرسێ بڕگە(فەقەرە) بۆ ئەدەبە واتە پەسندکردنە، لای شافعی لە بڕگەی ناوەند نەبێ بۆ پێویستە(وجوب)، لەبەر هاتنی حەدیس دەرحەق بە عەزابی ئەو کەسەی بەدەستی چەپ خواردن دەخوا لە پەرتووکی(رسالە) و لە پەرتووکی (أم) وای فەرمووە.

١١٧٧: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: طَعَامُ الإِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاثَةِ وَطَعَامُ الثَّلاثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواردنی لەتێری دووکەسان بەشی سێ کەسان دەکا بۆ پێڕابواردن و ئیدارەکردنی، خواردنی سێ کەسانیش بەسە بۆ ئیدارەی

چوازان.

١١٧٨: عَنْ إِبْنُ عُمَرَ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە کە عبداللە ی کوڕی عومەرﷺ عادەتی وابوو خواردنی نەدەخوارد هەتا فەقیرێکییان بۆ دەهێنا لەگەڵی دەخوارد، ڕۆژێك پیاوێکییان هێنا زۆری دەخوارد، بە خزمەتکارەکەی خۆی گوت: جارێکیتر ئەمە مەینە، خۆم گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئیماندار دەخوا لە وورگێك، یەعنی بۆ تێربوونی وورگێك، کافر دەخوا بۆ تێربوونی حەوت وورگان.

(ش): قورعوبی لە مەعنای ئەم حەدیسە گوتیتی شەهەواتی خواردن حەوتن، یەعنی حەوت شت ئارەزووی خواردن دەکا: (١) ئارەزووی سروشت، (٢) ئارەزووی نەفس (٣) ئارەزووی چاو، (٤) ئارەزووی دەو، (٥) ئارەزووی گوێ، (٦) ئارەزووی لووت، (٧) ئارەزووی برسیەتی.. ئەم ئارەزووەیان پێویستە بۆ ئیماندار تەنیا بۆ نەهێشتنی برسیەتی دەخوا، بەلاّم کافر بۆ نەهێشتنی ئارەزووی هەر حەوتیان دەخوا، ئەم وورگانە بۆ وێنە هێنانەوەیە.

(قاضی عیاض)یش نەقلی کردوە لە ئەهلی تەشریح کە ڕیخۆڵەی مرۆڤ حەوتن: (١) مەعدە واتە گەدە، سێیانی تریش تەنگن، بەستراونەتەوە بەگەدە کە بە ڕیخۆڵەی باریك ناسراون، سێیانیتریش ئەستوورن، واتە ڕیخۆڵەی ئەستوور. ڕیخۆڵە کوێرە و، قولون و موستەقیم و دەرەوەی کۆم، ئنجا چونکی کافر زۆر سوورە لەسەر خواردن هەتا هەر حەوتیان پڕ نەکا چاوی لەخواردن تێر نابێ، ئەمە حوکمێکی وایە بەشی زۆری کافر دەگرێتەوە، چونکی کەم وادەبێ کافری کەم خۆرو ئیمانداری زۆرخۆر، بەلاّم بە شەرع پێویستە هەرکەس خۆی بپارێزێ لە زۆرخواردن بە هەوەسی خۆی با هەرچەندە خۆیشی زۆرخۆریش بێ (کلوا وأشربوا ولا تسرفوا) ئەم حەوت ئەندامەی کە ئەهلی تەشریح باسیان کردووە ڕاستن.

١١٧٩: عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا آكُلُ وَأَنَا مُتَّكِئٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوجوحەیفەی وەهبی کوڕی عبداللە سەوائی، گوتی: لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دانیشتبووم، مەڕێکییان بە کولاّوی بۆ نارد، پێغەمبەریﷺ لەسەر ئەژنۆ بەجوانی دانیشت، عەرەبێکی بادیەنشینیش لەوێ گوتی: ئەم تەرزە دانیشتنە چییە؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((إن الله تعالى جعلني كريماً فلم يجعلني جباراً عنيداً)) یەعنی خـودا بەڕاستی منی گێڕاوە بە ئەهلی کەرەم و ئەخلاق، منی نەگێڕاوە بە ئەهلی زوڵم و عنـاد(واتـە ستەم و سەرڕەقی). من خواردن ناخۆم لەحاڵی پاڵکەوتن و لەسەر لاتەنیشتێك..

لێرە وەرگیرا مەکروهە خواردن بە پاڵ دانەوە، چونکی بەڕاستی ئەم جۆرە خواردنە نـەریتی پاشایەکانیعەجەم بوو بۆ خۆهـەڵکێش و خـۆ بەگەورەزانـەکان و بەدەعیـەکانیش چـاو لـەوان دەکەن، بەخودا خۆم دەپارێزم لە صفات و ئەحواڵی بەدەعیەو خۆیەگەورەزانەکان.

۱۱۸۰: عَنْ عَائِشَةَ، رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: التَّلْبِينَةُ مُجِمَّةٌ[٢] لِفُـؤَادِ الْمَرِيضِ تَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە(خـوای لیڕازی بـێ)؛ پێغەمبـەرﷺ عـادەتی وابـوو ئەگـەر یەکێك لە خزمەکانی وەفاتی بکردایە، ژنیش کۆبوونایەوە لـەماڵێ مردووەکـە، پاشـان وەکـو قەڵەباڵغی تێك دەچوو وە ژنەکان بڕۆیشتنایە، تەنیا کەس و خزمی مـردوو بمایـەوە، فـەرمانی دەکرد یەك(بورمە: واتە مەنجەڵێکی لەبـەرد دروسـت کـراو) مەلـەبی کـە لـە ئـارد و شـیر و هەنگوین لیدەنرا، لەپاشان تێگوشیش دروست دەکرا، مەلەبیەکەیان بەسەردا دەکرد، پاشان بە ئافرەتەکانی کەس و کاری مردووی دەفەرموو: بخۆن لەم خواردنە، گوێـم لەپێغەمبـەرﷺ بـوو فەرموی: تەلبینەکە ئەم خواردنەیە، حەسانەوە بەخشە بۆ سەر دڵێ ناساغ و هـەندێ غـەمیش لادەبا.

۱۱۸۱: عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه عنِ النَّبِيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لا تَلْبَسُـوا الْحَرِيـرَ وَلا الدِّيبَاجَ وَلا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَـا وَلَنَا فِي الآخِرَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانرضي الله عنه گوتی: بیستم لەپێغەمبەرﷺ فەرمووی مەبەستی قسەکردن بوو لەگەڵ پیاوان و نە ژن و نەمێردان، ئارمووشی لەبەر مەکەن و جلگـەکی بەشـی زۆری لە ئارموشی بێ لەبەر مەکەن. وە مەشخۆنەوە ئەوەی دەخورێتەوە لەبادەو بەرداخی زێـڕ و زیو. وە خواردنیش مەخۆن لە قاپ و لەنگەری و سینی زێڕ و زیو، چونکی ئارموش و زێڕ و

---

[٢] مُجِمَّةٌ: بەواتا- مريحة: حەسانەوەبەخشە.

زیو بۆ کافرانە لە دونیا وە تایبەتە بۆ ئێمە لەرۆژی دوایی (ئاخیرەت) لەتۆڵەی تەرك کردنمان لە دونیا.

١١٨٢: عَنْ أَبِي مَسْعُود، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّكَ دَعَوْتَنَا خَامِسَ خَمْسَةٍ وَهَذَا رَجُلٌ قَدْ تَبِعَنَا فَإِنْ شِئْتَ أَذِنْتَ لَهُ وَإِنْ شِئْتَ تَرَكْتَهُ قَالَ بَلْ أَذِنْتُ لَهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبومەسعودی ئەنصاری ﷺ گوتی: ئەبوشعیبی ئەنصاری کوڕێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، بەکوڕەکەی خۆی گوت بۆ دەعوەتی پێغەمبەرﷺ خواردنێکم بۆ دروست بکە، کە پێغەمبەرﷺ پێنجەمی پێنجیان بێ، ئینجا لەسەر ئەم ژمارە دیاریکراوە، پێغەمبەری داوەت کرد، پیاوێکیش طوفەیلی(مشەخۆر) بوو بەگەڵیان کەوت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ ئێمەت دەعوەت کرد کە من پێنجەمی پێنجەمان بم، ئەم پیاوەیش بەگەڵمان کەوت، ئنجا تۆ موخەیەری، ئەگەر حەزت لێیە ئیزنی بدە با بڕوا، ئەگەر حەزیشت لێیە وازی لێ بێنە بابێ.
ئەبو شوعەیب گوتی: ئیزنی دەدەم بابێ.

(ش) : لەم جۆرە حەدیسە وا زاندرا هەرکەسێك بێئیزنی خاوەن دەعوەت بۆ دەعوەتێك چوو خاوەنی موخەیەرە لە بەینی ئیزندان و واز لێهێنانی.

١١٨٣: عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، امْشُوا نَسْتَنْظِرْ لِجَابِرٍ مِنَ الْيَهُودِيِّ، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ عَرِيشُكَ يَا جَابِرُ؟ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: افْرُشْ لِي فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا جَابِرُ جُذَّ وَاقْضِ، فَوَقَفَ فِي الْجَدَادِ فَجَذَذْتُ مِنْهَا مَا قَضَيْتُهُ وَفَضَلَ مِثْلُهُ، فَخَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَشَّرْتُهُ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللە ی ئەنصاری ﷺ: گوتی: جولەکەیەك هەبوو لە مەدینە هەموو ساڵێك پێشین پارەی بەسەر خورما دەدامێ، هەتا وەقتی خورما لێ دەکرێتەوە. جابریش ئەم باغەی هەبوو کە لەسەر ڕێگای بیری رومە بوو، لەشاری مەدینەدا. ساڵێك لە بەرگرتن پاش کەوت، قەرزی جولەکەیش لەکاتی دیاریکراو کە کاتی رنینی خورمابوو پاش کەوت، جوولەکەیش گوتی: حەقی خۆمم هەر دەوێ، هەرچەندی داوای مۆڵەتم لیکرد هەتا ساڵێکیتر مۆڵەتی نەدام، هەتا بەڕادەیەك خەبەری دایە پێغەمبەرﷺ بە ئەصحابی فەرموو: بابرۆین داوای مۆڵەت بکەین بۆ جابر لە جوولەکە، جابر دەڵێ: لەنێو دارخورمایەکان هاتنە لام، پێغەمبەرﷺ هەر لەگەڵ جوولەکەدا بو بۆ اقناعی قسەی لەگەڵ دەکرد، جوولەکەیش هەر

دەیگوت: أباقاسم مۆڵەتی نادەم، پێغەمبەریش وەکوو ئەم ڕەقیـــەی لیٚدیـت هەڵســتا نـەختیٚ لەناو خورمایەکان گەڕا دووبارە هاتەوە گۆ جوولەکە، دووبـــارە جوولەکـە اقنـــاع هــەر نـەبوو، منیش کەمیٚ روتەبم بۆ پێغەمبەر هێنا. لە پێشم دانا، نەختێکی لیٚخوارد، پاشان فــەرمووی: کەپرەکەت لە کوێیە ئەی جابر؟ منیش خەبەرم پێدا، فەرمووی: شتێکم بۆ ڕاخە لە کەپرەکـە، منیش شتێکم بۆ ڕاخست، چوو لەسەر ڕاکشا کــەمێك خــەوت، دووبــارە هەڵســتاوە، منیــش گوڵمێکی تر روتەبم بۆ برد، نەختێکی خوارد، دیسان قسـەی لەگـەڵ جوولەکەکـە کـرد، هیـچ کەلکی نەبوو ئیقناع نەکرا.

هەڵستا چاوێکی لەو خورمایانە کرد کە بە دارەکان وەبوون، پاشان فەرمووی: ئــەی جـابر، خورمات ببڕە و حەقی جولەکە بدە لەکاتی بڕین ڕاوەستا، منیش دەستم بە بڕینی خورما کــرد هەتا حەقی جوولەکەم بەتەواوی دا، ئەمەندەی تریشی زیاد مایەوە، منیش چووم مــوژدەم بـە پێغەمبەر دا ﷺ وەکـو خەبـەری ئـەم کارەسەرسـوڕهێنەرەم پیٚڕاگـەیاند، فـەرمووی: بـەزمان ئیعتراف دەکەم بەدڵیش باوەڕ دەکەم بەبیٚ گومان من پێغەمبەری خودام، بۆیــیٚ وای فــەرموو چونکی ئەو میقدار خورمای کە بە دارەکانیەوە دیت بەشی نیوەی حەقی جوولەکەشی نەدەکرد، کەچی حەقی جوولەکەشی دا هەندەی ئەویش ماوە.

١١٨٤: عَنْ سَعْد، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَــوْمٍ سَــبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ سُمٌّ وَلا سِحْرٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاص ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سبەینان هەرکەسـێك لەپێش هەموو خواردنێك حەوت دانە خورما لە نەوعی (عەجوە) بخوا زیانی پیٚناگەیــەنیٚ لــەو ڕۆژەدا نە ژەهرێك و نە جادوێکیش.

١١٨٥: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلا يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی حــەزرەتی عــەباس ڕەزای خودایــان لیٚبیٚ گوتــی: پێغەمبــەر ﷺ فەرمووی: وەکو یــەکێکتان خواردنێکــی خــوارد، بــا دەســتی خــۆی نەسـڕێتەوە هــەتا خــۆی دەیلێسیتەوە، یاخۆ یەکێکی‌تر بۆی دەلێسیتەوە (چونکی هیچ کەسێك نازانیٚ خێروبەرەکەت لە کامە بەشێکی خواردن دایە).

١١٨٦: عَنْ أَبِي أُمَامَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوئیمامە-صەدا کوڕی عەجلان‌ﷺ گوتی: وەکو پێغەمبەرﷺ لەپاشی نان خواردن سفرەی لەپێش هەڵدەگیرا، ئەم سوپاس و ستایشەی دەکرد، دەیگوت: بۆ خودایە سوپاس و ستایشی زۆر پاك و بەبەرەکەت و بەزێدەکی و بەبێ‌کیفایەت و بەس لی‌کردن. لەلایەن ئێمەوە بۆ سوپاس و ستایشەکانی خودا وە بەبێ تەرك کرانی ستایش و بەبێ ئیستغنا لە حەمد و سوپاس، ئەی خاوەن نیعمەت و بەخێوکەر و پەروەردەکەری ئێمە.

١١٨٧: عَنْ أَبِي أُمَامَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مَكْفُورٍ.

(تەرجەمە)

لە ریوایەتێکی تریش ریوایەت کراوە لە ئەبوئیمامە صەدای کوڕی عەجلان‌ﷺ پێغەمبەرﷺ لەپاش نان خواردن دەیگوت: سوپاس و ستایش بۆ خودا بێ کە بە تێری کیفایەتی ئێمەی داوە، وە لە خواردنەوەیش تێری کردووینە، بەبێ کیفایەت و بەس لی‌کردن لەلایەن خودا بۆ نیعمەتەکانی لەسەر ئێمە وە بەبێ جەحد(پێنەزانین) و کوفران و ئینکاری ئێمەش بۆ نیعمەت و چاکەی خودا دەرحەق بەئێمە.

## (كتاب العقيقة والصيد والذبائح)

## باسی قوربانی منالّ بوون و ڕاو و کوشتی

١١٨٩: دەگێڕنەوە لە سەلمانی کوڕی عامری‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەگەڵ لەدایك بوونی کوڕ قوربانی(عەقیقە) بۆ کوڕان دوو مەڕ بۆ کچانیش مەڕێك بکوژنەوە، وە مووەکانیشی لابەن لەڕۆژی هەفتەمی لەدایك بوون.

١١٨٨: عَن أَبِي هُرَيرَةَ: لأفرَعَ ولا عَتِيرة، والفرعُ أوّلُ النّتاج كانوا يَذْبَحُونَهُ لِيَطَّئُوا غَيَتِهِمْ، والعَتِيرَةُ فِي رَجَبَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ فەرەع نی‌یە وە هیچ عەتیرەش نی‌یە لە ئایینی ئیسلام. فەرەع: بە یەکەم بێچووی ووشتر یا مەڕ دەڵێن کە زابێ. بۆ

بوتەکانیان دەیان کوشتنەوە.. (عەتیرە)ش حەیوانێکیان دەکوشتەوە لە دەرۆژ پێش هاتنی مانگی ڕەجەب بۆ بوتەکانیان و گۆشتەکەیان دەخوارد و پێستەکەیان دەهاویشتە سەر دارێك، هەرکەسێك بە چاولیکردن(تەشەبوە) ئەمانە بکا واتا چاو لە کافران بکا کافر دەبێ.

(ش): تەفسیری فەرەع و عەتیرە لەلایەن پێغەمبەرﷺ ئیشارەیە وەبال عیلەتی نەهی یەعنی کوشتنەوەی فەرەع ئەگەر بە نیەتی بوتەکان نەبێ بەڵکو بۆ خودابێ شتێکی باشە. حەتا ئەوەوی گوتیتی: ئیمامی شافعی وای گوتوە فەرەع و عەتیرە. باشن لەبەر حەدیسی ئەبوداود و نسائی وەکو پرسیار لەپێغەمبەر کرا لەفەرەع فەرمووی(الفرع حق) بەلام بە شەرتێك بۆ خودابێ.

## (كتاب الذبائح والصيد)

## باسی کوشتی و ڕاو

١١٨٩: عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْهُ وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ، مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَ الْكَلْبِ زَكَاةٌ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ أَوْ كِلابِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ، فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَهُ مَعَهُ، وَقَدْ قَتَلَهُ، فَلا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تَذْكُرْهُ عَلَى غَيْرِهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عودەی کوڕی حاتەمی کوڕی عبداللەی طائی کە لەساڵی گرتنی مەککە موسوڵمان بوو، لە فەتحی عێراق و شەڕەکانی حەزرەتی عەلی ئامادە بوو، باوکی ناسراوبوو بە سەخی و بەخشندە، وە هەتا ساڵی ٦٨ کۆچی ژیا. لە تەمەنی سەد وبیست ساڵی وەفاتی کرد، گوتی: لە حوکمی نێچیرێکی بە (مِعراض) بکوژرێ پرسیم لە پێغەمبەرﷺ، (مِعراض) دارێکی تیغ لەسەر یەك لا گیراوە، تایبەت بووە بە سوارانی ڕاوکەر لەو کاتە بۆ کوشتنی نێچیر، هەیش بووە لە هیچ سەرێك تیغی لەسەر نەبووە، هەروەکو ئەوەوی وای ڕاست کردووتەوە لەم زەمانە بە زمانی کوردی پێی دەڵێن (جلیت) بەلام لەهیچ سەرێك تیغی نییە، ئێستاش کە لەساڵی ١٣٧٢ هەزار و سێسەد و حەفتاودووی هیجری(کۆچی) داین، لەبەر نەمانی تەراد و ڕمبازی سواران بەلکی بە سەدەیەکیش پێش ئێستا جلیت ناوەکەی نەبێ هیچی تری نەماوە).

فەرمووی هەر نێچیرێکی بەلای تیژ کوژرابێ حەلاڵە، وە هەرچی بەلایی پانایی کوژرابێ ئەمە حوکمی کوژراوی بۆ نیە حەلاڵ نییە خواردنی، بەلکی ئەمە پێی دەڵێن (وەقیذ) هەروەکو حەیوانێك بەبەرد کوژرابێ وایە. هەروەکوو ئایەت دەفەرموێ بە تیغ نەکوژرابێ بەلکی بەبەرد یا بەدار کوژرابێ.

پاشان له نێچیری تاژی لێم پرسی، فەرمووی: هەر نێچیرێکی تاژیەکەی تۆ بۆی گرتی یەعنی نەی خوارد، بیخۆ، چونکی گرتنی سەگی ڕاو کوشتنەوەیە بۆ نێچیر، وە ئەگەر تۆیش چی سەگێکت پێ بوو یان چەند سەگێکت پێبوو، بەڵام سەگێکی تریشی‌یان لەگەڵدا بوو وەکوو تێت بەردا، پاشان ترسیشت هەبو کە سەگەکەی بێگانە لەگەڵ سەگەکەی تۆ گرتبێتیان وە کوشتبێتیشی، یەعنی چەقووی پێڕانەگەیشت، کە بکوژرێتەوە، مەیخۆ، چونکی تۆ وەکوو تێت بەردا بسم اللّەیت هەر لەسەر سەگی خۆت کرد لەسەر سەگەکەی بێگانەت نەکرد.

(ش): لێرە زاناو ئیمامەکان ڕای جیاجیایان هەبوە، ئایا گوتنی بسم الله مەرجە بۆ حەڵاڵ بوونی خواردنی یا مەرج نی‌یە. لای ئیمامی شافعی و ریوایەتێکی ئیمامی مالك و قسەپەسندی ئیمامی ئەحمەد بسم الله گۆتن سونەتە، لای قسەی ڕاجح(پەسند)ی ئیمامی ئەحمەد بسم الله کردن واجبە، چونکی لەم حەدیسەی عودەی گوتنی بسم الله ی کردە هۆی حەڵاڵ بوون.

ئنجا ئەوانەی کە لایان سونەتە نەگوتنی بسم الله قەی‌ناکا، بەڵام ئەبوحەنیفەو مالك و جمهور گوتویانە بەسەهو-واتە لەبیرچوون- دروستە نەگوتنی بسم الله.

زانیشمان لەم حەدیسە لەکاتی تێبەردان نابێ سەگی بێگانەی لەگەڵ دابێ، بەڵام بە مەرجێك ئەگەر بێگانەکە سەربەخۆی بەرەڵلا بوبو یاخۆ لە دەست کەسێك بەرەڵلا کرابوو دەست کوژی دروست نەبو، بەڵام ئەگەر بە موحەقەقی (مسۆگەری) لەدەست کەسێکی وا بەرەڵلا کرابوو دەستکوژی ڕاست بوو، واتە موسوڵمانی نێری عاقڵ و تەمەن تەواو (بالغ) بو دروستە خواردنی.

پاشان ئەگەر تانجی هەردوو ڕاوکەرەکان پێکەوە بەیەك جار تێبەردران، نێچیرەکە بە یەکسانی(مساوات) نی هەردوویانە، ئەگەر نا کامەی پێشان تێبەردرا هی ئەوە.

١١٩٠: عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ، قَالَ رسول الله: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلا تَأْكُلُوا فِيهَا وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا غَيْرَهَا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرِ مُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوثەعلەبەی خوشنی ﷺ گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە بەنی خوشنی کە هۆزێکە لە هۆزەکانی قوضاعەی ئەهلی کتاب لە وڵاتی شام، ئایا بۆمان دروستە لە قاپ و قاچاغی ئەوان شت بخۆین؟ [illegible] بۆ ڕاو دەست دەدا، وادەبێ بە تیروکەوان

بۆ ڕاو دەچم، واش دەبێ تانجی دەبـەم، وا دەبـێ تانجی‌یەکـە فـێرەڕاو کـراوە، واش دەبـێ فـێر نەکراوە، لەمانە کامەی بۆ من حەلاڵە بیخۆم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەما ئەو شتەی کە لە قاپ و قاچاغی ئەهلی کتاب دایە، ئەگەر شتێکی‌ترتان غەیری ئەو دەست دەکەوێ لـە قـاپ و قاچاغی ئەوان مەخۆن، ئەگەر غەیری قاپەکانی ئەوان هیچی ترتان دەست نەکەوت، بیان شـۆن و لەنێویاندا بخۆن.. وە هەر نێچیرێکی بەتانجی فێرکراو بگرێ لـەکاتی تێبـەردانیش گوتبێتـت بسم الله بیخۆ، ئەوی بەتانجی فێرنەکراویش گیرابێ بە کوشتنەوەیشی ڕاگەیشتی بیخۆ.

(ش): ئەم حەدیسە دەلیلە و بەلگەیە بۆ ئیمامی ئەحمەد و ئەوانـەی حوکمیـان بـە واجـب بوونی بسم الله کردووە لەکاتی کوشتنەوە.

١١٩١: عَنِ ابْنَ عُمَرَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنِ اقْتَنَـى كَلْبًا لَيْسَ بِكَلْبِ مَاشِيَةٍ أَوْ ضَارِيَةٍ، نَقَصَ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطَانِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی حەزرەتی عومەرﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك سەگێك ڕابگرێ بۆ پاراستنی مەڕ و ماڵاتی خۆی نەبێ و بۆ ڕاو نەبێ، ئینجا ڕاوەبەراز بێ ڕاوە کەروێشك بێ، هەرچی بێ، کەمی پەیا دەکا هەر ڕۆژێك لە خێرەکانی دو قـیراط، یـەعنی دوو بەش لە بەشەکانی چاکە.

لە حەدیسی ئەبوهورەیرە لەباسی موزارەعە قیراط ڕۆن کرایەوە.

١١٩٢: عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ لَيْسَ بِهِ إِلاَّ أَثَرُ سَهْمِكَ فَكُلْ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْمَـاءِ فَلا تَأْكُلْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عودەی کوڕی حاتەم بە گێڕانەوەیەکی‌تر بە زیادە لەسەر گێڕانـەوەی پێشـوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عودەی، ئەگەر تیرت هاویشـتە نێچـیر و بزریشـت کـرد، پاشـان لەپاش ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دۆزیتەوە، غەیری جێی‌تیرەکەی تۆ نەبێ هیـچ برینـی تـری نـەبو، بیخۆ.. وە ئەگەر کەوتە ناو ئاو مەیخۆ، چونکە لەوانەیە بە ناو خنکابێ، بەلاّم بە موحەقـەقی زاندرا بەئاو نەخنکاوە بـەلکی بـە تیرەکـە مـردووە، یـا یـەکدوڕۆژیش مردبـێ لای جمـهوری شافعیەکان حەلاڵە.

١١٩٣: عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوموسیی ئەشعەری(عبدالله ی كوڕی قەیس) گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وێنەو مسالی هەمنشینی باش و بەد وەكو كەسێكە مسكی هەڵگرتبێ وە فووكەری كوورەی ئاسنگەرە، چونكی ئەوەی مسكی هەڵگرتووە وەكوو چوویە لای، یاخۆ بەخۆڕایی هەندێ بێنی خۆشت پێوە دەكا، یاخۆ، ئەختێكی لیٚ دەكری، یاخۆ ئەگەر بەخۆڕاییش هەندێ بێنی خۆشت پێ نەدا یان تۆش لیٚی نەكڕی، هەر نەبێ كە چوویە لای بێنێكی خۆشت بۆ دێ، یەعنی مُوتلەقەن رەفیقی باش سوودەك و فائدەیێكی بۆت هەر دەبێ.. بەڵام فووكەری كوورەی ئاسنگەر وەكوو چوویە لای یان شمەكت بە پروشكان دەسووتێنێ، یاخۆ بێنێكی ناخۆشت پێ دەدا، یەعنی زەرەر و زیانێك لە رەفیقی بەد هەر دەبینی، هەرنەبێ بەدناوی لای خەڵكی، راستی فەرمووە خودا دەفەرموێ (وَكُونُوا مع الصادقين).

(ش) بەم حەدیسە پیرۆزە استدلال كراوە ئەگەرچی مسك پێزگێكە لە خوێن، وەكو گرێ لە ناوكی مامزی تاتار دەبێ، بەڵام بە خوێن پیس نابێ، وەكو شیر و مەنی بەرەگوێێن گۆڕاوە، ئەگەرچی لەخوێنیشن پاكن، هەروەكوو قورئانی مەجید دەفەرموێ (مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ).

## (كتاب الأضاحي)

## باسی قوربانی

١١٩٤: عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلا يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ وَبَقِيَ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ.. فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالَ: كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەع؄ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەركەسێك لەنێوە قوربانی كوشتەوە، نەمێنێ لە گۆشتی قوربانیەكەی لەپاش رۆژی سێیەم لەكاتی كوشتنەوەوە هیچ شتێك.. پاشان وەكو ساڵ سووڕاوە، كاتی كوشتنەوەی قوربانی داهاتەوە، عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا، ئیمساڵیش وەكوو پار لە گۆشتی قوربانی بە خاوی و بە كوڵاوی هیچ

به زەخیرە هەڵنەگرین؟ فەرمووی: بخۆن وە بشدەنە هەژارو بە زەخیرەیش بە خاوی و بە کـوڵاوی بۆ خۆتان هەڵیگرن، چونکی ساڵی پێشوو قەدەغەم کردن لـە هـەڵگرتن بـۆ زەخـیرە سـاڵێکی سەخت بوو خەڵکی لە تەنگانەدا بوون، مەبەستم یارمەتی هەژاران بدەن.

(ش): صیغەتی ئەمر لە (**کلوا وأطعموا**) بۆ ماوەدان و ئیباحەیە، بۆ واجب بوون نی‌یـە.. لای جمهور سونەتێکی پەسندکراوە موئەکەدەیە لای شافعی فەرزی کفایەیـە. خـاوەنی کتێبـی کفایە کە حەنەفیە گوتیتی: واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی جێنشین و هەبوو دەوڵەمەند لە ڕۆژی جەژنی قوربان لەجیاتی خۆی و منالی بچووکی قوربانی بکوژێتەوە، چونکی لای ئیمامی ئەعزەم و محمد و زفر و لای دوو لە ریوایەتی کـە لـە ئەبویوسـف کـراوە قوربـانی واجبـە لای شافعیەکان و مالکیەکان و حەنبەلیەکان سونەتە.

## (کتاب الاشربة)

## باسی خواردنەوەکان

**١١٩٥: عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ.**

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی حەزرەتی عومەرﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسـێك شـەرابی خواردبێتـەوە لـە دونیـا لەپاشـانیش تۆبـەی لێ نـەکردبێ، بێبـەش دەبـێ لـەڕۆژی دوایی(ئاخرەت) لە شەرابی بەهەشت.

(ش): ئنجا یا لەبەر بەحەلاڵ زانینی چونکی کافر دەبێ هەر ناچێتە بەهەشتیش، چە جـای لە شەرابی بێبەش دەبێ.

یاخۆ دەچێتە بەهەشت، چونکی بە حەلاڵی نەزانیوە، بەلام لـە نایـاب تریـن و فـاخرترینی خواردنەوەی بەهەشت کە (خەمر)ە بە صەریحی ئایەت (**والخمر لـذةٌ للشـاربین**) بێبـەش و مەحرومە.. بەلام ئارەزووی خواردنەوەیش ناکا لە بەهەشت وە حەسودیش بەو کەسە نابـا کـە دەیخواتەوە، بەلکی حالی وەکو حالی خاوەن پایەکانە لە بەرزی و پەستی، یەعنی چلۆن حـەز لە پایەی ئەو کەسە ناکا کە لەخۆی بەرزترە، بەم تەرزە حەز لە خواردنەوەی (خەمر)یـش ناکـا لەبەهەشت، قورطوبی وای گوتووە.

وەردەگیرێ لەم حەدیسە پیرۆزە تۆبە گوناهی رابردوو دادەپۆشی با زۆریش بێ.

١١٩٧: عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهُ إنَّ النَّبِيَّ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وفي رواية: وَلا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ أَبْصَارَهُمْ فِيهَا حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زیناکەر زینا ناکا مەگەر کاتی زینا ئیمانی تەواو نییە(چونکی لە درەختی باوەڕی کە هەفتاو ئەمەندە لقەیە لقی حەیای کەمە)، یەعنی ئەگەر شەرمی لەخودا بکردایە زینای نەدەکرد.. وە دزینش دزی ناکا مەگەر لەکاتی کە دزی دەکا بەتەواوی ئیماندار نییە، شەرابخۆریش نارەق ناخواتەوە، مەگەر لەوەختی خواردنەوەی شەراب ئیماندار نییە.. (لەریوایەتێکی تریش) بەئاشکرا لەپێش چاوی خەڵکی پیاوێکی بە قەدرو بەشەرەف رەزیلی ناکا مەگەر لەو وەختی کە ڕەزیلی دەکا ئیمانی نییە.

١١٩٧: عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خوای لیڕازی بێ) گوتی: پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا لە حوکمی خواردنەوەی نەبیذی هەنگوین، چونکی خەڵکی یەمەن دەیان خواردنەوە.. فەرمووی: هەر شەرابێك مەستی بدا حەرامە.

(ش): بەو میقدار(هەند)ەی کە خواردبێتی بەوەیش مەستی نەکردبێ، چونکی ئەبوداود و نسائی کە ئیبنی حەبانیش ڕاستی کردووتەوە لە جابر کە پێغەمبەرﷺ فەرموویتی: (مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ) واتە ئەو شەرابەی زۆری پیاو سەرخۆش بکا کەمەکەیشی هەر حەرامە. شافیعیەکان و مالکیەکان و حەنبەلیەکان و جمهور لەسەر ئەم قسەیەن، لای حەنەفیەکانیش شەرابی مێوژ و خورما ئی تریش وەکو کولاو توند و تیژ بوو حەرامە، بەلام حەد واجب ناکا هەتا بە کردەوە(فعلاً) سەرخۆش نەکا. بەحەلاڵ زانینی ئەمانەیش کوفر نییە.

بەلام ئەو شەرابەی لە ئاوی ترێیە کەم و زۆری حەرامە، ئەوی بە حەلاڵیشی بزانی کافر دەبێ، ئەوی دەشیخواتەوە حەدی لەسەر پێویست و واجبە با سەرخۆشیشی نەکردبێ.

١١٩٨: عن أَبِي عَامِرٍ الأَشْعَرِيُّ قال النَّبِيّ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ يَرُوحُ عَلَيْهِمْ

بِسَارِحَةٍ لَهُمْ يَأْتِيهِمْ لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا، فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ وَيَضَعُ الْعَلَمَ وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبو عامری ئەشعەری، عبداللە ی کوڕی هانیء، کە هەتا زەمانی عبدالملك ابن مروان ژیا، گوێی لێبوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە ئومەتی مـن پەیا دەبێ چەند قەومێك زینا و ئارمووش و شەراب و ئالاتی لەهو لەعب(واتە ئامێرەکانی گەمەو گاڵتە) بە حەڵاڵ دەزانن وە دایش دەبەزن چەند قەومێك لە تەنیشت کێوێکی بەرز، شوانیان مەڕ و ووشتر و ماڵاتی ئەوان سبەینان دەباتە لەوەڕ، هێواران دەیان هێنێتەوە، یەعنی خودا ماڵێ زۆری پێداون، لەگەڵ ئەوەش دەرۆزەکەرێك دەچێتە لایان بۆ پێویستی‌یەك پێی دەڵێن: سبەینێ بگەڕێوە لامان. خودا بەشەو عەزابیان دەنێرێتە سەری و کێوەکە بەسەر هەندێکیاندا دەڕوخێنێ، ئەوانی تریش هەندێکی‌یان ئەکا بە مەیمون و هەندێکیان ئەکا بە بەراز هەتا ڕۆژی قیامەت.

(ش): لای هەندێ زانایان بەشێوەیەکی ڕاست و حەقیقی لای هەندێکانیش بەڕەووشت و هەڵس و کەوت و ئەخلاق و ڕەفتار و کردار.. شەرقاوی مەعنای پێشووی هەڵبژاردووە، واتا بەڕاست و حەقیقی دەبنە مەیمون و بەراز.. نووسەری ئەم دێرانەش (واتە دانەری ئەم پەرتووکە) معنای دووەمی هەڵبژاردووە، چونکی مەسخ بەشێوەی ڕاست و حەقیقەت هەتا ڕۆژی قیامەت بڕاندنەوەیە، کلمەی ئەزەلیش لەسەر ئەمەیە ئومەتی محمد(کە هەڵگرانی ئاینی ئیسلامن) وەکو خودا فەرموویتی: (وَلَوْلاَ كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأُجَلٌ مُسَمًّى)، ئنجا ئەوانەی استدلالیان بەم حەدیسە کردووە لەسەر گرتنەوەی کلمەی مسخ بە ئومەتی محمدیش وەکو ئومەتانی پێشوو بەڵگەکانی شەرعی قبوڵی ناکا بورهان و بەڵگەی عەقڵیش قبووڵیی ناکا، چونکی زاووزێ لە نەتەوەکانی مەسخ کرابن واتە وەرگەڕابنە سەر شێوەی حەیوانات، لەسێ ڕۆژ زیاتر نەژیاون، جا هەڵبژاردنی دانەری ئەم پەرتوکە بۆ مەعنای دووەم و هەڵنەبژاردنی ئەو مەعنایەی شێخی شەرقاوی بۆی چووە، لەبەر هێزی عبارەتی حەدیس بۆ هەڵگرتنی گەلێ مەعنایە.

١١٩٩: عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَّ خَمَّرْتَهُ وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُودًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللە ی ئەنصاری گوتی: ئەبوحومەید عبدالرحمانی

ساعدی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ لە نەقیعەوە کە نەورێکە لە وادی العقیق، پێغەمبەرﷺ پاوانی کردبوو، بۆ لەوەڕی ماڵاتی حەیوانات و ئاژەڵ. لە کۆتکێکدا هەندێ شیری بۆ پێغەمبەرﷺ هێنابوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆچی سەرت دانەپۆشیبوو، ئەگەر بە ڕاهێشتنی دارێك بوایە لەسەر پانایی کۆتکەکە.

(ش): حیکمەت و مەبەست لە دانانی شتێك لەسەر قاپ ئەگەر دارێکیش بێ بسم اللهی لەگەڵدایە، شەیتانەکان بە دانانی ئەم شتە دەزانن بسم اللهی لیکراوە ئنجا نزیکی نابن.

١٢٠٠: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نِعْمَ الصَّدَقَةُ اللَّقْحَةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً وَالشَّاةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً تَغْدُو بِإِنَاءٍ وَتَرُوحُ بِآخَرَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خێری باشە ووشتری بەشیری بژاردەو باش بەدۆخۆر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بیدە هەژارێك.. خێری باشیشە مەڕی بەشیری بژاردە کە سبەینان جامەشیرێك دەداو هێواران جامەشیرێك دەدا بەدۆخۆر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو(موەقەت) بیدەیە هەژاران.

١٢٠١: عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنَّةٍ وَإِلاَّ كَرَعْنَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللهی ئەنصاریﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ چووە لای ئەبو ئەطیەمی کوڕی بتهانی ئەنصاری، حەزرەتی ئەبوبەکریش لەگەڵیدا بوو، فەرمووی: ئەگەر لات هەیە ئاوێك شەوی بێ لە کۆنە دێمکەیەکدا، پێمان بدە بخۆینەوە، ئەگەر نا دەڕۆین، هەروا دەمی خۆمان لە ئاوێك دەنێین بێ قاپ و فافۆن دەی خۆینەوە. پیاوەکەی ئەنصاریش گەڕا لە باغەکەی خۆی دۆزیەوە، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا، ئاو هەیە، بەڵام تەشریف بفەرموون بۆ بن کەپرەکەی باغەکەمان. هەردوویانی بردە بن کەپر، ئاوەکەی لە کوتکێك کرد، مەڕە دابەستوێکیشی لەماڵێ بوو بەسەر ئاوەکەیدا دۆشی، پێغەمبەرﷺ پێشان خواردیەوە، پاشان ئەبوبەکریش خواردیەوە.

(ش) لەمە زاندرا خواردنەوەی شیری تێکەڵ لەگەڵ ئاوی سارد لە وولاتی گەرم بەسوودە.

وَإِلاَّ كَرَعْنَا: بفتح الرّاء أي شربنا من غير اناءٍ ولا كفٍ بل بالفم.(شرقاوي)

١٢٠٢: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئومی سەلەمەی دایکی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك دەخواتەوە لە قاپی زیو، بەڕاستی هەر ئاگری دۆزەخ بەڕاکێشان دەخاتە نێو زگی خۆی.

## (كتاب المرضى)

## باسی نەخۆشان

١٢٠٣: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلا وَصَبٍ وَلا هَمٍّ وَلا حُزْنٍ وَلا أَذًى وَلا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعید سەعدی کوڕی مالکی خودری وە لە ئەبوهورەیرە(عبدالرحمن کوڕی صەخر) (خودا لێیان ڕازی بێ) گوتیان: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تووشی هیچ موسوڵمانێك نابێ ماندوبوونێك وە نە هیچ ناساغییێك لە بەدەن و قالبی خۆی، وە لە دەروونی خۆی تووشی هیچ غەمناکیەکیش نابێ لەسەر کاروباری دوارۆژ وە تووشی غەمیش نابێ لەسەر کاری رابردوو وە تووشی هیچ ئەزیەتیش نابێ و تووشی غەمی زۆریش نابێ کە غەم دایپۆشی، هەتا تووشی دڕکێك نابێ کە لە قالبی ڕاچووبێ ئیلا مەگەر خودا ستر دەکا بە هەر یەکێك لەم کاروبارانە لە گوناهەکانی.

(ش): لەم حەدیسە پیرۆزە زاندرا موسوڵمان لەسەر بەسەرداهاتنی کارەسات پاداشتی بۆ دەنوسرێ بە پێچەوانەو (خلافی) ئەو کەسانەی کە دەڵێن پاداشت و سزا (ثەواب و عقاب) لەسەر ئەوەیە کە پەیدای دەکا لەسەر کارەسات نییە، چونکی کاری عەبد نیە. بەڵام لەسەر ئارام گرتن و پێ‌ڕازیبوون بەم کارەساتە پاداشت هەیە. بەڵام کەی ئەم موخالفانە مەردودە چونکی صەبر و خۆڕاگرتن و ڕازیبوون کارێکن حەدیس نایان گرێتەوە(خارجن)، ممکنە زیاد لەسەر پاداشتی کارەساتەکە لەسەر ڕازیبوون و ئارام گرتنی و صەبریش پاداشتیان ببێ.

ئیمامی غەزالی(خوای لێ‌ڕازی بێ) موصیبەت(کارەسات) دەکاتە سێ بەش: بەشی (یەکەم) موصیبەتی پیاوی دووڕوو منافقە وەکو کەوتە ناو موصیبەتێك دەرحەق بە خودای گەورە تووشی ناڕازی بوون و ئیعتراض دەبی، موصیبەت بۆ ئەو عقوبەتە.

(دووەم) کارەساتی پیاوی ئیمانداری ئارام گرتووە، ئەگەرچی زۆریش لە ئـازار و عـەزابیش دابێ پاکە لەوەی بەکاری خودا ڕازی نەبێ بەکاری خودا ڕازیە بۆ ئەمە کەفارەتی گوناهە.

(سێیەم) ناساغی و کارەسات بە نیعمەتێك دەزانێ، ئنجـا لـە موقابەلـەی ئـەم نیعمەتـە سوپاس و ستایشی خودا دەکا بۆ ئەو کەسەش تەرفیعی دەرەجاتە(بەرزی پلـە)، جگـە لـەوەی خودا لە خراپەکانیشی خۆش دەبێ.

١٢٠٤: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: مَثَـلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ كَفَأَتْهَا، فَإِذَا اعْتَدَلَتْ تَكَفَّأُ بِـالْبَلاءِ. وَالْفَاجِرُ كَالأَرْزَةِ صَمَّاءَ مُعْتَدِلَةً حَتَّى يَقْصِمَهَا اللَّهُ إِذَا شَاءَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنـەوە لـە ئـەبوهورەیرەﷺ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: صفـەتی ئیمـاندار دەربـارەی ڕازیبوونی بە قەزاوقەدەر وەکو صفەتی دەغڵێکی تازە بەناسـکی لەسـەر یـەك قـاچ لـەعارد هاتبێتە دەرێ، لەهەر لایێك بایێکی بۆ بێ مەیل بەولادا بدا. پاشان وەکو هەوایشـی نـاوەنجی بوو ڕاست و ڕاست ڕادەوەستی، بەڵام کارەسات و موصیبـەتیش بـۆ ئیمـاندار وەکـو بایـە بـۆ دەغلی تازە لەگەڵ هەر بەلایێکدا خۆی لەگەڵ ئەو ڕێـك دەخـا. سـوپاس و ستایشـی خـوداش لەسەر ئەو حاڵە دەکا کە تێیدایە، ئنجا هەرچی بێ.. پیاوی بێ ئیمانیش وەکو داری (ئـەرزە- شجرة الأرز) چونکە زۆر توند و ڕەق و ئەستورە، بەلای هیچ لایەك مەیل ناکا بهەژێ، بـەڵکی ڕاست ڕاوەستاوە، ئەگەرچی درێژیشە هەتا خودای گەورە دەیشکێنێ هەرکاتێکی حەز بکا.

یەعنی پیاوی ئیماندار خودای گەورە لە دونیا ئاوڕی لێ دەداتـەوە بەبـەلایان، کـە ببێتـە کەفارەی گوناهان و تەرفیعی دەرەجات )واتا بەرزی پلەکان لای خودا) تا کاتێك کـە بردیـەوە لای خۆی بکەوێتە خۆشی پاش مردن.. پیاوی منافقیش خودا ئاوڕی لێ ناداتـەوە بـە بـەلایان بەڵکی لە دونیا دەیخاتە حەسانەوە و استراحەت، تا کاتی مـردن ئنجـا دەیشـکێنێ، ئەگـەر سەد ساڵ لەخۆشیدا بوبێ لە دونیا دووسەد ئەمەندەشی بخەیەسەری لەبەرامبەر ئەو دەقیقـەی کە تیا شکاو فەوتا، گۆیا یەك دەقیقە لەزەتی لە تەمەنی خۆی نەدیوە.

خامة: دەغلی تازە دەرچووی یەك لقە.

١٢٠٥: عَنْ عَبْدِاللَّهِ بن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَجَـلْ وَمَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلاَّ حَاتَّ اللهُ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ.

(تەرجەمە)

ارزە: داری سنۆبەری نێرە.

حات: دەوەرێنێ.

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ گوتی: لە ناساغی خۆی چوومە خزمەت پێغەمبەر لە شیدەتی تا ڕادەجەفلی، عەرزم کرد، سەختی ئەم تایەی تۆ ئایا لەبەر زۆری پاداشتە؟ فەرمووی: بەڵێ، هەموو موسوڵمانێك ئەزیەتێکی تووش ببێ ئیلا مەگەر خودا گوناهی ئەو هەڵدەوەرێنێ وەکو هەڵوەرانی پەلکی دار لەجیاتی ئەزیەتەکە، بە مەرجی صەبر و شوکر. مەبەست لە (خطایا) گوناهی بچووکە بە قەرینەی حەدیسی (الصلوات الخمس والجمعة الی جمعة ورمضان الی رمضان کفارة لما بینهن ما اجتنبت الکبائر).

١٢٠٦: عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوڕی عەباسﷺ بە یەك لە ڕەفیقانی خۆی گوت: ئەرێ ژنێکت نیشاندەم لە ئەهلی بەهەشت بێ، ڕەفیقەکەی گوتی: بەڵێ، گوتی: ئەم ئافرەتە ڕەشە هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێی گوت: من خوو دەگرم، هۆشم لەخۆم نامێنێ، قالبم بەدیاردەکەوێ، دوعام بۆ بکە خودا لەم خووە شیفام بدا چاکم بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: موخەیەرت دەکەم ئەگەر حەزدەکەی خۆت ڕاگرە لەبەر ئەم بەڵایەو بەهەشت بۆ تۆ بێ، وە ئەگەر حەزیش دەکەی دوعات بۆ دەکەم خودا شفات بکا.. ئافرەتەکە گوتی: خۆم ڕادەگرم، بەڵام قالبم بەدیار دەکەوێ، دوعام بۆ بکە قالبم بەدیار نەکەوێ.. ئنجا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کرد.

١٢٠٧: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ تعالى قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ يُرِيدُ عَيْنَيْهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەسﷺ گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودای گەورە فەرموویەتی: وەکو بەندەیەکی خۆم تووش کرد بە لێستاندنی دوو خۆشەویستی خۆی کە هەردوو چاوێتی، پاشان لەبەر قەزاوقەدەری خودا خۆی ڕاگرت، هیچ ناشکوری نەکرد، خودا لە تۆڵەی چاوەکانی بەهەشتی پێ دەدا.

بەڵام بە مەرجێ چاوەڕێی تۆڵە کردنەوەو پاداشتی پیاوی خۆڕاگر و صابر لەسەر بەڵایان

لەلایەن خودای گەورەیە ئەگەر ئەم نیەتەی لەناو دڵ نەبێ مەعلوم نی‌یە بۆی دەبێ.

١٢٠٨: عَنْ عَائِشَةُ اَنها قَالَتْ: وَا رَأْسَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ذَاكَ لَوْ كَانَ وَأَنَا حَيٌّ فَأَسْتَغْفِرَ لَكِ وَأَدْعُوَ لَكِ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: وَا ثُكْلِيَاهْ! وَاللَّهِ إِنِّي لَأَظُنُّكَ تُحِبُّ مَوْتِي، وَلَوْ كَانَ ذَاكَ لَظَلِلْتَ آخِرَ يَوْمِكَ مُعَرِّسًا بِبَعْضِ أَزْوَاجِكَ! فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَلْ أَنَا وَا رَأْسَاهْ! لَقَدْ هَمَمْتُ أَوْ أَرَدْتُ أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ وَأَعْهَدَ، أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ، ثُمَّ قُلْتُ يَأْبَى اللَّهُ وَيَدْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ أَوْ يَدْفَعُ اللَّهُ وَيَأْبَى الْمُؤْمِنُونَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە دایکی ئیمانداران گوتی: پێغەمبەرﷺ تەشریفی لە بەرێکردنی جەنازەیەك لە بەقیع گەڕاوە، چاوی بە من کەوت ژانەسەر گرتبوومی، هەر دەمگوت وای سەرم من دەمرم، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەگەر تۆ بمری منیش زیندوو بم داوای لێبووردنت(مەغفرەت) بۆ دەکەم و دوعات بۆ دەکەم.. حەزرەتی عائشە فەرمووی: وای لەخۆم بێوەجاغ و بێکەسێ، واللە من وا ظەن دەبەم دەرهەق بەتۆ پێت خۆشە بمرم، وە ئەگەر من بمرم ئاخری ئەوێ ڕۆژێ پی‌مردم بەزاوایەتی دەچیە لای هەندێ ئافرەتەکانت.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەلکی لەبەر ژانی سەرم، من وای سەرم(یەعنی تۆ واز لەخۆت بینە بە منەوە خەریك بە من سەرم زۆر ژان دەکا، تۆ نامری لەم زوانە لەپاش من دەمێنیەوە))، بە تەحقیق قەصدم بنێرمە دوای ئەبوبەکر و کوڕەکەی تەوصیەی بکەم بە خەلافەت لەجێگای من دابنیشێ نەوەك هەرکەس بۆخۆی بڵێ خەلافەت بۆ فلان کەس باشە، یەکێکی‌تر بڵێ بۆ فلان کەس باشە، وە هەتا ناکۆکیش ببڕێ لە بەینی ئەوان کەسان ئارەزووی ناکۆکی و خیلافیشیان هەیە، هەرکەسێ نەڵێ کاشکی من خەلیفە بوومایە. پاشان لە دڵی خۆم گوتم: خودای گەورە مانعە لە بەخشینی مەنصەبی بەرزی خەلافەت بە غەیری ئەبوبەکر، وە ئیمانداریش لێناگەڕێن غەیری ئەبوبەکر لەجێگای پێغەمبەر دابنیشی.

(ش): مەبەستی کۆکردنەوەی کوڕ لەگەڵ ئەبوبەکر لە پەیمان و عەهد بە خەلافەت کە هیچ پەیوەندی و دەخلیشی بە خەلافەت نەبوو، لەبەر دڵ وەرگرتن و استمالەی قەلبی عائشە بوو، چونکی لەگەڵ هەبوونی سەرئێشان لە گفت و گۆی پێشوو لە بەینیان دڵی ئازووردەبوو، ئنجا گۆیا پێی دەڵێ: چلۆن من تۆم خۆش ناوێ و حەز دەکەم بمری، من بۆ خەلافەتیش لەجێگای خۆم باوکی تۆم هەڵبژارد و اختیار کرد، وە بۆ موشاوەرەش لە کاروباری خەلافەت برای تۆم هەڵبژارد (یەعنی باوك و براو و خزم و کەسی تۆ مەحرەم و ئەهلی موشورەتن بۆ من، ئینجا

چلۆن ظەن دەبەی من حەزم بە مردنتە.

١٢٠٩: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لا بُدَّ فَاعِلاً فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەس ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با هیچ یەکێکتان بەئارەزوو داوای مردن نەکا لەبەر زیان و زەرەرێك (لەناساغی و هەژاری و شتیتریش) تووشی بووبێ، پاشان ئەگەر زمانیشی هەر ڕانەوستا لە پۆرەپۆر، با ئەمەند بلێ: ئەی خودایا، بمژێنە هەتا ژیان باشە بۆ من، و بیشم مرێنە ئەگەر مردنم بۆ باشە.

(ش): یەعنی لایق نییە بۆ ئیماندار کە خەریکی زاد و زەخیرە پەیدا کردنە بۆ ڕۆژی دوایی(ئاخیرەت) دوعای بڕینی ماوەی پەیداکردنی زەخیرەی ئاخیرەت بکا کە ماوەو مودەی ژیانیتی لەدونیا.

١٢١٠: عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا عَمَلُهُ الْجَنَّةَ، قَالُوا: وَلا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لا وَلا أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِفَضْلٍ رَحْمَتِهِ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَلا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ؛ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْرًا، وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاری باش و تاعەتی هیچ کەسێك کەسێ ناباتە ناو بەهەشت (یەعنی ئەصلی چوونە بەهەشت بەچاکەی خودای گەورەیە، بەلاّم تەفاوتی دەرەجات بە تەفاوتی ئەعمالە، واتە ئەگەر بەراوردیەك هەبێ لە پلەکاندا بە کردەوەیە) ئەگەر نا لازم دێ حەدیس لەگەڵ ئەم ئایەتە ڕێك نەکەوێ کە دەفەرموێ (سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) یەعنی هەڕوونە ناو پلەبەرزەکانی بەهەشت بە سەبەب کردەوەتان).

عەرزیان کرد: نە تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: نە منیش، بەلاّم ئەمەندە هەیە خودا نەك ئەصلی بەهەشت بە بەخشینی مەرحەمەتی خۆی منی داپۆشیوە. ئەصلی چوونە بەهەشت بەچاکە و احسانی خودایە، بەلاّم بەراوردی لەنێوان پلەکان بەگوێرەی تەفاوتی کار و کردەوەیە. ئنجا مەبەستی ئەوەیە چاکە بکەن بە ئیخلاص و دڵسۆزی لەو کارو کردەوە (یەعنی

به دەرەجەییَکی وا خۆتان زۆر ماندوو مەکەن لە خواپەرستی کـە لـە طاعـەت و خواپەرستی بیّزارو مەلول بن نەوەك بەتەواوی واز لە خواپەرستی بیّنن وە سەربکیّشی بۆ تەرکی تاعەت.)
هیچ یەکیّکیشتان تەمەناو داوای مردن نەکا، چونکی یاخۆ پیاوی باشە خیّرو چاکـە بـۆ خـۆی زیاتر دەکا یاخۆ پیاوی خراپە داوای رازیبوونی خودا دەکا، بەلکی خودا لەخراپەکانی عـەفوی دەکا بە سەبەب تۆبەو لەخوا پاڕانەوە.

١٢١١: عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ بَعْضَهُمْ: أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ وَاشْفِ وأَنْتَ الشَّافِي لا شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لا يُغَادِرُ سَقَمًا.

(تەرجەمە)

دەگیّڕنەوە لـە حـەزرەتی عائشـە(خـوای لیّ‌ڕازی بـێ) پیّغەمبـەرﷺ وەکـوو بجوایـە لای نەساغیّك، یا نەساغیّکیان بهیّنابایە لای، ئەم دوعایەی بەسەردا دەخویّند، شیدەت و سـەختی لابە ئەی خالق و بەخیّوکەری ئینسان. شیفا ببەخشەو هەر تۆ شیفادەری، هیچ شیفایەك نییـە بە هیچ جۆریّك شیفای تۆ نەبێ. شیفایەکی وا کە بەجێ نەهیّلێ هیچ نەساغییەك.
(ش): پیّغەمبەرﷺ عادەتی وابوو دوعا بۆ چاك بوونەوە بکات، دوعـای دەکـرد بـۆ چـاك بوونەوەی تەواو بۆیێ دەیفەرموو (شفاءاً لا يغادر سقماً) یەعنی خودایا دوعای تایبەتی ئـەم دەردەت لیّناکەم بەم تەرزە، ئەگەر ئەم دەردە برواو دەردیّکی تر بیّتە جێ، بەلکی داوای چـاك بوونەوەی تەواو (مطلق)ت لیّدەکەم لە هەموو عیللەتیّك، نەك داوای چاك بوونـەوەی موتلـەق کە لە یەك دەردیش بێ هەر شیفایە.

## (كتاب الطب)

## باسی پزیشکی

بسم الله الرحمن الرحيم

١٢١٢: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً.

(تەرجەمە)

دەگیّڕنەوە لە ئەبوهورەیرەؓ گوتی: پیّغەمبەرﷺ فەرمووی: نەینارد‌وتە خـوارێ خـودای گەورە هیچ دەردیّك، مەگەر لەبەرامبەر ئەو دەرمانیّکیشی تەقدیر کردووە.

١٢١٣: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الشِّفَاءُ فِي ثَلاثَةٍ: شَرْطَةِ مِحْجَمٍ وَشَرْبَةِ عَسَلٍ وَكَيَّةِ نَارٍ وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵای حەزرەتی عومەرﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چاك بوونەوە لە نەخۆشی لەسێ شتە: یەکەم لە لێدانی کەڵەشاخە بۆ خوێن گرتن، دووەمیان خواردنەوەی فرەهەنگوێنە بۆ ئاسان کردنی ئەخلاطی بەلغەمی، سێیەم یا داغ کردنێکە بە ئاگر و نەهیش دەکەم ئومەتی خۆم لە داغ کردن (یەعنی کە لە دونیاش تووشی عەزابی ئاگر بێن) سوودی کەڵەشاخیش موختەصە بە وولاتانی گەرم، وەکوو حیجاز مەسەلەن. بەلام لە ولاتانی گەرم خوێن گرتن بە نەشتەر باشترە.

١٢١٤: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ؟ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَى الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَاهُ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ؟ فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً، فَسَقَاهُ، فَبَرَأَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوسەعیدی خودریﷺ گوتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێی گوت: برام زگی دێشی؟ فەرمووی: بچۆ هەنگوێنی بدێ.. چوو هەنگوێنی دایێ، هاتەوە عەرزی پێغەمبەری کرد: هەنگوێنم دایێ خراپتر بوو، فەرمووی: بچۆ هەنگوێنی پێ بدە، هەتا سێ جار بەم دەستورە، هەر فەرمووی هەنگوێنی پێ بدە، جاری چوارەم هاتەوە گوتی: زگی زیاتر دێشێ، هەنگوێنەکەیشم پێدا، فەرمووی: خودا راست دەکا کە فەرموویتی (فیە شفاء للناس)، زگی برای تۆ درۆ دەکا، بچۆ هەنگوێنی پێ بدە، ئەم جارەش دەرخواردی دا لە ژانەزگ قورتار بوو.

(ش): هەنگوێن بۆ هەر دەردێك لە ساردی بێ شیفایە.

ئەم پیاوەی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ ژان و دەردەکەی برای لەبەر زۆری شتی پیس بوو، بۆیە پێغەمبەرﷺ پەی دەرپەی ئەمری پێدەفەرموو: هەنگوێنی بدێ، ئنجا هەنگوێنی بۆ هەر نەساغی‌یەکی کە لە سەرما پەیدابوبێ باشە، بەلام خودای گەورە ئەگەر بیفەرموویایە (فیە الشفاء للناس) یەعنی لامی جنس و استغراقی بخستایە سەر شیفا، هەنگوێن دەبووە شیفا بۆ هەموو دەردێك هەرچی بوایە.

١٢١٥: عن عَائِشَةَ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ هَذِهِ الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ مِنَ السَّامِ، قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: الْمَوْتُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گوتـی: گوێـم لێبـوو پێغەمبـەرﷺ دەیفەرموو: ئەم ڕەشکەی کە لەنان دەکرێ کە بە عـەرەبی پـێی دەڵێـن (حبـة السـوداء) بـە زمانی تورکیش قرجەی پێ دەڵێن شیفایە و مایەی چاك بوونەوەیە بۆ هەموو دەردێك بـۆ سـام نەبێ، پێم گوت: سام چییە؟ فەرمووی: مردنە.

(ش): مایەی چاك بوونەوەیە بۆ هەموو دەردێك کە لە سـاردی و شـێ و ڕطوبـەت پـەیدا بووبێ، نەك بۆ ئەم نەخۆشیانەی کە لە گەرمایی پەیدا بووبێ، بـە اتفـاقی دکتـۆران ڕەشـکە تەبیعەتی گەرمەو ووشکە بۆ لابردنی با وە بۆ تـای سـێبەرۆ وە بـۆ بەڵغـەم بەکەڵکـە وە بـۆ مەنفەذی گیراو وە بۆ بایی منعقد(گرێدراو) واڵاکەرەوەیە.

وە ئەگەر بکوترێ وە بکرێتە هەویر لە هەنگوێن پاشان بەناوی گەرمیش بکرێتە شەربەت و بخورێتەوە، هەر بەردێکی لە میزدان هەبێ ئەیتاوێنێتـەوە، میزەکـە بـەرەڵڵا دەبـی. وە ئەگـەر حەوت دەنك ڕەشکە بخرێتە شیری ژنێك ئەوەی تووشی یەرەقان (زەرتك) بووبـێ لـەلووتی بکـا یەرەقانی نامێنێ.

١٢١٦: عَنْ أُمِّ قَيْسٍ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئومی قەیسی کچی محصن ئەسەدیەی کە لە ئافرەتـەکانی موهاجیر و کـۆچ کردوو بوو لە مەکە بۆ مەدینە، گوتی: گوێم لێبوو لە پێغەمبـەرﷺ دەیفـەرموو: ئـەم داری هیندییە(عود هنـدی) بـەکاربێنن، چونکـە بێشـك دەرمـانی حـەوت دەردی تیایـە، وەکـوو بڕمووتی لە لووت دەکرێ لەبەر گەرووئێشان و مەڵاشووکەوتن کـە بـەزۆری تووشـی منـداڵان دەبێ، وەکوو شەربەتیش بەدەمی نەساغەوە دەکـرێ لـەپاش کوڵانـی لـەنێو ئـاو لەبـەر ژانـی تەنیشت و ذەروون و ئەویایەی کە لە کەلەکە توند بووە. باقی حەدیسـیش لـە کتـابی طـهارە (واتە باسی پاك و خاوێنی) ڕەت بوو.. وەکوو گوتی چوومە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ کوڕێکـی شیرخۆرم پێبوو، هێشتا خواردنی پێنەدەخورا، میزێکی بەسەر کۆشیدا کرد، ئـەمری فـەرموو ئاویان بۆ هێنا کۆشی خۆی ڕشاند.

١٢١٧: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ، وَقَالَ: لا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ.

(تەرجەمە)

دەگێرنەوە لە ئەنەس ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشترینی ئەو شتی کە ئێوە بۆ خۆتان دەیکەن بە دەرمانی عیلەتان، کەڵەشاخەو سۆتکەی بەحریە، چونکی سۆتکە کە بە عەرەبی (قسط)ی پێ دەڵێن و (کُست)ی پێ دەڵێن و عودی هیندیشی پێ دەڵێن وەکو لە حەدیسی ئومی قەیسی لەپێش ئەم حەدیسە ڕەت بوو سێ جۆری هەیە، هیندی و بەحری و شامی، باشترینیان سۆتکەی بەحریە کە شیرین و سپی و سووکە، خراپترینیان سۆتکەی شامیە کە ڕەشەو تاڵە).

وە فەرمووشی منالەکانتان عەزاب مەدەن بە مل گوشینیان، لەبەر کەوتنی و قونێری مەلاشوو، لازمی ئێوەبی تەداوی گەرو مەلاشوو بە سۆتکە بەم تەرزە سۆتکە بەئاو بسوونەوە لە لووتی بکەن.

١٢١٨: عن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ وَالنَّبِيَّانِ يَمُرُّونَ مَعَهُمُ الرَّهْطُ، وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، حَتَّى رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ، قُلْتُ: مَا هَذَا؟ أُمَّتِي هَذِهِ؟ قِيلَ: هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ، قِيلَ: انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ، فَإِذَا سَوَادٌ يَمْلأُ الأُفُقَ، قِيلَ: هَذِهِ أُمَّتُكَ. وَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ هَؤُلاءِ سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ، هُمُ الَّذِينَ لا يَسْتَرْقُونَ وَلا يَتَطَيَّرُونَ وَلا يَكْتَوُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ.. فَقَالَ عُكَاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ: أَمِنْهُمْ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا؟ قَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَاشَةُ.

(تەرجەمە)

دەگێرنەوە لە عبداللە ی کوڕی عباس ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو ئومەتەکانم نیشاندران، ئنجا دیتم یێك یێك دوودوو پێغەمبەر ڕەت بوون، هەر یەکێك بیستسی کەسێکی لە قەومی خۆی لەگەڵدابوو چل کەس نەدەبوون. دیتیشم پێغەمبەر ڕەت بوو هیچ کەسی لەگەڵ نەبوو، هەتا قەڵەبالغی و ڕەشاییەکی زۆرم بۆ بڵند کراو نیشانم درا، گوتم: ئەمە چیە؟ ئایا ئەمە ئومەتی منە؟ گوترا: ئەمە موسایەو قەومەکەیتی، گوترا: تەماشای لای ئاسمان بکە، وەکو دیتم چاوم بەڕەشاییەك کەوت لایەکانی ئاسمانی پڕ کردبوو، گوترا: ئەمە ئومەتی تۆیە، وە دەچنە بەهەشتیش لەمانە حەفتاهەزار بەبێ حساب، ئەوانیش ئەوان

کەسانن وەکو عادەت و نەریتی زەمانی پێش هاتنی اسلام(جاهلیەت) بە حیلەو ئەفسون و گرێ ئیدعای چاك کردنەوەی نەساغان ناکەن و تەشائوم(رەش بینی) بە تەیرو شتی وا ناکەن، وە تەداوی چاك کردنەوە بە داغ ناکەن، تەنیا ئومێدیان هەر لەسەر کەرەم و بەخشینی خودایە..

لەو ئەنجومەنە(مەجلیسە) عوکاشەی کوڕی میحصەن گوتی: ئەرێ من لەوانم؟ ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ لەوانی، یەکێکی تریش ڕاست بۆوە گوتی: ئەرێ منیش لەوانم؟ پێغەمبەرﷺ بۆ خاتری تەمەع بڕینی ئەوانەی لەم ئەنجومەنە دانیشتبوون لەم وەڵامی ئەم پرسیارە فەرمووی: بۆ ئەم پرسیارە عەکاشە پێشی تۆ کردی، یەعنی هیچ کەسیتر زیاتر درێژەی نەداتێ کە نهێنی و ئەسرارەکانی خودا بەدیار بخەم لە هەر کاتێك بۆ هەر کەسێك.

(ش): لە حەدیسی روفاعەی جوهنی لای ئیمامی ئەحمەد لەگەڵ تەصحیحی (ابن حبان)، پێغەمبەرﷺ فەرموویتی: (وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ لا يَدْخُلُوهَا حَتَّى تَبَوَّءُوا أَنْتُمْ وَمَنْ صَلَحَ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَذَرَارِيِّكُمْ مَسَاكِنَ فِي الْجَنَّةِ). ئەمە دەلالەت دەکا لەسەر ئەمە کە مەزیەت و گەورەیی حەفتاهەزار بەچوونە بەهەشت ئەمە ناگەیەنێ کە ئەم حەفتاهەزارە لەوانیتر گەورەترن، بەڵکی هەیە لەوانەی کە کەمێك حسابی لەگەڵ دەکرێ گەورەترە لەوان.. لای ترمذی و نسائی ناوەرۆکی(مضمون)ی ئەم حەدیسەی (عرض) لە شەوی میعراج بووە لە مەدینە لەپاش میعراجی مەککە، ئەمەش وا دەگەیەنێ میعراج چەند جارێك بووە.

١٢١٩: عن أَبِي هُرَيْرَةَ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا عَدْوَى وَلا طِيَرَةَ وَلا هَامَةَ وَلا صَفَرَ وَفِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەؓ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە نەساغەوە هیچ چوونە نەخۆشییەك نییە لە یەکێك بۆ یەکێکیتر، هیچ تطیر و تەشئوم(ترسان و ڕەش بینی) بە بورجەکان، یەعنی هەر شتێك بەدیارکەوت یاخۆ لاچوو مەیکە نیشانەی بێتالعی و بەدفەڕی.

هیچ گۆڕانی ئێسقانی مردووانیش نییە بووبێتە جەستەی کوندەبۆیەك و بفڕێ. (چونکی لە جاهلیەت-پێش هاتنی ئیسلام-وایان دەزانی ئەگەر کەسێك بکوژرایەو تۆڵەی نەکرابوایەوە ڕووحەکەی ئەبوو بە تەیرێك هەر ئەی قاڕاند دەیگوت: تینوومە، ئەختێ خوێنی قاتلەکەی خۆم پێ بدەن بیخۆمەوە، هەتا تۆڵەی دەکرایەوە، ئنجا دەڕۆیشت و دەفڕی) هیچ شەئامەت(بەدبینی) و گەش بینی نییە بۆ مانگی (صەفەر). وە ڕاکە لەبەر پیسك و

گول(گوڕی) وەکو ڕاکردنت لەبەر شێر، چونکی خصوصی عیلەتی گولی زیاد لەهەمو عیلـەتان بە ئیرادەی خودا دەچێتە یەکێکی تر و، ناچێتە یەکێکی تر.

١٢٢٠: عن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم: فَمَـنْ أَعْدَى الأَوَّلَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە گوتی: عەرەبێکی بیابان نشین بە پێغەمبەری گوت: نازانم بۆچی ووشترەکانی من وەکو لە نـاو زیـخ دەڕۆن گوێـا مـامزن، وەکـو لـە لاڕاش ووشـترێکی گوڕییان دێتە ناوێ ووشترەکانی من گڕوو دەکا، تۆیش دەفەرموی: لە عیلەتان لێـك گرتنـەوە نی‌یە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی ووشترەکەی پێشوو لەکێ گرتووتەوە؟ کێ تووشی کردووە؟ یەعنی ووشتری یەکەم ئەویش لە یەکێکیتر نەیگرتووتەوە، هیچی پـەیدا نـەکردووە، هـەموو بەقەزاوقەدەر و ئیجادی خودای گەورەیە.

ئەم وەڵامەی پێغەمبەر لە غایەتی بەلاغەت دایـە، یـەعنی ئەگـەر دەڵێـن ئـەم ووشـتری یەکەمیش لە ووشترێکی تری گرتووتەوە، وای لێدێ وەکو زنجیرەی لی‌بێ، ئنجا وەڵامـی تریـان نامێنێ، ئەوەندە نەبێ بڵێن کێ ووشتری پێشووی گڕوو کـرد؟ هـەر ئـەویش ووشـتری دووەم و ئەواتی تری گڕو کرد، کە خالقیکەو کارتێکەرێکە(مؤثر) هیچ پەرستراو نی‌یە ئـەو نـەبێ، بـە وەڵامێکی کورت و بەڵگەدار بە بەڵگەو بورهانی قەتعی عەرەبەکەی بێدەنگ کرد.

١٢٢١: عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوری مالکی ئەنصری ئەنصاری گوتی: پێغەمبەر فـەرمووی: تاعون شەهیدبوونە واتە هەرکەسێك بە نەخۆشی تاعون بمری شەهیدە و لە قیامەت لـە پایـەو مەرتەبەی شەهیدانە.

١٢٢٢: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اسْتَرْقُوا لَـهَا فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ، قاله لِي جَارِيَةٍ فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئومی سەلەمەی دایکی ئیمانداران (خوای لی‌ڕازی‌بێ) گوتـی: پێغەمبـەر

له خانووی خۆی چاوی به کچێك کەوت نەخۆشی (سەفعە)ی هەبوو، یەعنی لـەڕووی سـۆرایی هەبوو ڕەشایی یاخۆ زەردایی بەسەردا هاتبوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چارەو عیلاجی یەکێك بکەن شتێك بەسەردا بخوێنێ ئەمە چاوزاریەتی. یەعنی لەلایەن مرۆڤ یا لەلایەن جـن چـاوی پیس کاری لیکردووه..

خطابی گوتیتی چاوی جن تیژ و بەبڕیارترە لە سـەری نـێزەو ڕم.. ئـەم حەدیسـە دەلیـل و بەڵگەی چاووزارە، هەروەکوو حەدیسێکی تریش فەرموویتی (العين حقّ).

١٢٢٣: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ لِلْمَرِيضِ: بِسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا يُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لـە حـەزرەتی عائشـە(خـوای لیڕازیبـێ) پێغەمبـەرﷺ لەسـەر نەسـاغان و بریندااران و ژانداران ئەنگوستی پیرۆزی خۆی تەڕدەکرد بە تفی خۆی لەسەر عاردێکی خـۆڵاوی دادەنا، ئەنگوستی پیرۆزی هەندێکی لە خاکەکە هەڵدەگرت، بەسەر ئەو جێگایەی دادەهێنا کە ئێش و ئازاری هەیە، وە ئەم دوعایەشی بەسـەردا دەخوێند (مەعناکەیشـی ئەمەیـە): بەنـاوی خودا خۆڵی عاردی ئێمە کە مەدینەیە یا هەر عاردێك هەبێ، بە تفی هەندێك لە ئێمـە چـاك بکەوەو شیفا بدە نەساغی ئێمە، بەئیزنی خودای بەخێوکەری ئێمە.

١٢٢٤: عن أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا طِيَرَةَ وَخَيْرُهَا الْفَـأْلُ، قَالُوا: وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنـەوە لـە ئـەبوهورەیرەرضي الله عنه گوتـی: بیسـتم لـە پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: هیـچ بەدبینی(تەشەئوم) نی‌یە بەهیچ شتێك، باشترینی گەشبینی‌یە(فەئلە) یاخۆ مـەعنای ئەمەیـە باشتر لە بەدبینی گەش بینی‌یە، ئەمەش تەیەمون بە قسەی باشە.

پێیان گوت: فەئل چی‌یە؟ فەرمووی: قسەیەکی باشە گوێی لیبێ یەکێکتان کە بی‌یـەوێ نیشێکی بکا قسەکە ئەوە بگەیەنی کە نەجاتی بی لە کارەکە، وەکوو ئـەوەی شـتێکی بـوێ، گوێی لیبێ یەکێك بانگ دەکا ئەی (واجد) واتە خاوەن هەبوون، یا نەسـاغێك گـوێی لیبـێ یەکێك بلێ ئەی (سالم) واتە خاوەن تەندروستی.

(ش): لە زەمانی پێشی ئیسلامەتی(جاهلیەت) عادەتیان وابوو ئەگـەر یـەکێك بەسـەفەر بچووبایە، تەیرێکیش لەلایی ڕاستی بفڕیبایە تەیەمونی پێدەکرد، دەیگوت ئەمـە باشـە یـان

ئەم سەفەرەم باش دەبی، دەوامی دەكرد لەسەر سەفەرەكە، وە ئەگــەر لــەلایی چـەپی بفڕیایـە پێی خراپ بوو لە سەفەرەكە دەگەڕاوە، پێغەمبـــەریشﷺ لــە حەدیســی ئیســماعیلی كــوڕی ئومەیەی لای عـبدالرزاق فەرموویتی: (ثلاثة لا یسلم منهن أحد: الطیرة والظن والحسد، فإذا تطیرت فلا ترجع) یەعنی بە سەبەب ئەوەی كە بەدبین بی لەوەی بترسێی كە كارەكـەت سـەر نەگری، لەسەری مەگەڕێوە، بەڵكی بڵێ (اللهم لا یأتي بالحسنات إلاّ أنت، ولا یدفع السیئات إلاّ أنت، ولا حول ولا قوة إلاّ بالله) واتا: ئەی خودایا كەس چاكە نایینی تۆ نەبی، و كەسیش خراپە لانادا هەر تۆ نەبی، وە هیچ چارەو هێزێك نی‌یە تەنیا بەخودای گەورە نەبێ.

١٢٢٥: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَنَّ دِيَةَ مَا فِي بَطْنِـهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ.. فَقَالَ وَلِيُّ الْمَرْأَةِ الَّتِي غَرِمَتْ: كَيْفَ أُغْرَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ لا شَرِبَ وَلا أَكَلَ وَلا نَطَقَ وَلا اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ بَطَلَ؟! فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: دوو ئافرەت لە هۆزی (هوذەیل) كە یـەكێكیان نـاوی ئومی عەفیفی كچی مەسروع بوو، ئەویتر مەلیكەی كچی عوێمر بوو، بەشــەڕ هــاتن، ئومــی عەفیف بەردێكی بۆ مەلیكە هاوێشت بە ووزگی كەوت حاملەش بــوو(واتــە ســكی هــەبوو)، منداڵەكەی ناو زگی كوشــت، كێشــەیان كەوتــە لای پێغەمبــەرﷺ، فــەرمووی: تۆڵــەی ئــەم منداڵەی كوژراو لەناو زگی دایكی عوڕەیەكە یەعنی جەسەدێكە، بەندەبێ یاخود جاریە بێ.

مێردی ئەمی عەفیفی قاتلە(كوژەرە)كە ناوی حەملی كوڕی مالكی كوڕی نابغەی حــەذلی بووﷺ، كە تۆڵەی كەوتە سەر، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چلۆن تۆڵەی كوژراوێك بدەم كە نە هیچی خواردووتەوەو نە هیچیشی خواردووەو نە قسەیشی كــردووە وە نــە هیــچ دەنگیشــی لی‌هاتووە؟! كوژراوی وا هیچ تۆڵەی نی‌یە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئوم حەمەلی كوڕی مالك دەربارەی ڕازاندنــەوەی خواپەرستی بــە سەمع و قافیە بۆ ئیسپاتی كاری پڕوپووچ لە برای كاهینانە (یەعنی دەیەوێ بە بەدیارخستنی قسە ڕەوانی خۆی حوكمی شەرعی بەتاڵ بكاتەوە).

(ش): پاشان پێغەمبەرﷺ لەبەر ئەمە لەلایەن خواوە فەرمانی پــێ‌كرابوو ڕوو لــە نــەزانان وەربگێڕێ و لی‌یان ببورێ، سزای نەدا، بەڵام تۆڵەی لی ئەستاند.

ئنجـا بەڕاســتی عبــارەتێكی ڕازایــەوەی لــە ئەنجومــەنی پێغەمبـــەرﷺ بــە بەرپــەرچ دانەوە(موداخەلە) نەدا كرد، بەم تەرزە چوار كاری ڕابردوو(ئەفعالی ماضیە)ی مەنفیە لــە دوو

یەکتری بەبێ جیاکردنەوە ڕیز کردووە لەگەڵ اتخاذی فاعل لەهەر چواریان لەسەر بنای ئاخری هەرسێ بڕگە(فەقەرە) بەپیتی (لام).

١٢٢٦: عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا أَوْ إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ سِحْرٌ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی حەزرەتی عومەرﷺ گوتی: زەبریقانی کوڕی بەدری کوڕی أمریء القیس کوڕی خەلەف لەگەڵ عەمری کوڕی سەنان لە خزمەت پێغەمبەرﷺ کۆبوونەوە کە لە نەسەب و خزمایەتیش لە کەعبی کوڕی ئەسعەدی کوڕی زەیدی مەناة کوڕی تەمیم کۆدەبنەوە. لە هۆزی بەنی تەمیم بوون، جێگایان لە ڕۆژهەلاتی شاری مەدینە بوو بەلای عێراقەوە بوو. هەریەکە خوطبیەکییان لە ئامادەبوونی پێغەمبەرﷺ خوێندەوە لە بەدیارخستنی فەصاحەت و بەلاغەتییان عالەمیان خستە تەعەجوب و سەرسوڕمان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی لە هەندێ بەدیارخستنی پێویست جادوو هەیە، یاخۆ فەرمووی: بەجێگەیاندنی بەیان و ڕۆن کردنەوەی پێویست بە هەندێ عبارەتی کورت و کۆکەرەوە بۆ مەعنای زۆر جادووە (یەعنی چلۆن لە سحر هێزێکی ڕاکێشەر هەیە چاوو دڵان بۆ خۆی ڕادەکێشێ، لە بەجێگەیاندنی داواکانیش بە عبارەتەکانی کورت و بەڕۆن کردنەوەو تێگەیاندن، ڕاکێشەرێك هەیە بۆ ڕاکێشانی دڵان و ووردبینی گوێگر تەشبیهی بەیان کراوە بە سحر.

١٢٢٧: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ووشتری ناساغ نابردرێتە ناو ووشترانی ساغ، چونکی زۆر وادەبی عیلەتەکەیان دەچێتە ساغەکان..

ئەم حەدیسە پیرۆزە کە تایبەت و موختەصە بە ووشتر، موختەصە بۆ حەدیسی (لا عدوی ولا طیرة)، ئەویش کە هەر حەدیسی ئەبوهورەیرە بوو بە حەوت حەدیس لەپێش ئێرە ڕەت بوو حەدیسێکی عام و گشت بوو لە حەیواتان و ووشتر و ئینسان، یەعنی گواستنەوەی نەخۆشی لە ووشتر هەیە لە حەیوانات، هەروەکو گواستنەوەی نەخۆشی گوڕیەتی هەیە لە ئینسان کە لە حەدیسی (لا عدوی) ڕەت بوو فەرمووی (وفرّ من المجذوم) ئەوەی لەم حەدیسانە وەردەگیرێ گواستنەوەی نەخۆشیو عیلەت لە ووشتر و گوڕیەتی نەبێ لەهیچ شتی تر نییە.

١٢٢٩: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَاءُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك خۆی فڕەبدا لەسەر کێویێك و خۆی بکوژێ، ئەمە لەنێو ئاگری جەهەنەم هەر خۆی فڕەدەداتە نێو ئاگر بە ئەبەدی و هەتاهەتایە.. مەبەست لە ئەبەدی زۆر مانەوەیە.

وە هەرکەسێکیش قوم لە ژەهر بدا و خۆی بکوژێ، ژەهرەکەی هەر بەدەستەوەیە قومی لێدەدا لەنێو ئاگری جەهەنەم هەتاهەتایە، واتە ماوەیەکی زۆر.

وە هەرکەسێکیش بە تیغێکی ئاسن خۆی بکوژێ تیغەکەی هەر بەدەستەوەیە لە ووردگی ڕادەکرێ لەناو ئاگری جەهەنەم بۆ کافر هەتاهەتایە، وە بۆ موسولمانیش هەتا زەمانێکی زۆر.

١٢٢٩: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً وَفِي الآخَرِ دَاءً.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وەکوو مێش کەوتە ناو قاپی یەکێکتان خواردنێك یان خواردنەوەیەك کە تیابێ تەواوی مێشەکە لە خواردنەکە یا لە خواردنەوەکە هەڵبێنێ پاشان فڕەی بدا، چونکی لە لاباڵەکی شیفا هەیە لە لاباڵەکەی تریش دەرد هەیە.

(دانەر دەڵێ): ئەغلەبیش بە لاباڵی ژەهراوی ئەکەوێتە ناو شت، ئنجا واباشە تیا نقوم بکرێ تا ژەهر و شیفا موقابل بێ.

لەم حەدیسە وا زاندراوە کەلاکی مێش با پیسیش بێ خواردن پیس ناکا، بۆیێ فەرموویەتی کەلاکەکە لە خواردنەکە نقوم بکەن، با خواردنەکە بۆ خواردن ژەهراوی نەبێ.. پاشان ئەهلی فروع قیاسی هەموو حەیواناتی بێخوێنیان لەمێش کردوە وەکو مێروولەو دووپشك و قرژاڵ و کرم، ئەگەرچی کەلاکیان پیسە شت پیس ناکەن بە مردوویش چ جایی بە زیندوویی.

# (كتاب اللباس)

## باسى جلك

بسم الله الرحمن الرحيم

١٢٣٠: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفِي النَّارِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوەندە جلکەی لە خوارترینی گۆزینگان بێ لەعارد بخشێ بە شانازییەوە (افتخار) لە ئاگرە یەعنی عادەتی ئەهلی فەخر ونەهلی ئاگرە کە جلکیان لەعارد بخشێ.

(ش): ئیمامی شافعی گوتیتی ئەگەر بۆ شانازیکردن جلك درێژ بکا حەرامە، سزاو عقوبەتی هەیە، ئەگەر نا پەسند نییەو مەکروهە.

١٢٣١: عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ.. قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟! قَالَ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟! قَالَ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ، عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوذەری غفاریﷺ گوتی: جارێك هاتمە خزمەت پێغەمبەرﷺ جلکێکی سپی لەبەر بوو، خەوتبوو گەڕامەوە.. پاشان دووبارە هاتمەوە خزمەتی بەخەبەر هاتبوو، فەرمووی: هەر بەندەیەك گوتبێتی لا اله الا الله لەگەڵ محمد رسول الله، پاشان لەسەر ئەم عەقیدەو بیروباوەڕە بمری موتڵەقەن بەهەر جۆرەك دەچێتە بەهەشت (لە پێش ئاگر یا لەپاش ئاگر تۆبەی کردبی یا تۆبەی نەکردبی، لای قسەی پەسند و ڕاجح) منیش پێم گوت: ئەگەر زیناو دزیشی کردبی؟ فەرمووی: با زیناو دزیشی کردبی.. گوتم: با زیناو دزیشی کردبی؟! فەرمووی: با زیناو دزیشی کردبی، بە خۆڵاویبوونی لووتی ئەبوذەر. (یەعنی بۆیە ئەمەندە دووبارەی دەکەیەوە دیارە پێت ناخۆشە، خودا لە دزی و زینای ئیماندار خۆشبی، ئنجا لە ڕقی تۆ کە پێت ناخۆشە خوا لیّیان خۆشبی خودا لووتیشت خۆڵاوی دەکا و زەبوونت دەکا. ئنجا دەیان باتە بەهەشت) ئینجا هەرجارە ئەبوذەر بۆ شکاندنی خۆی و پێخۆش بوونی بەقسەی پێغەمبەرﷺ دەیگوت: (وإن رغم أنف ابي ذرّ) یەعنی با خۆڵاویش بێ لووتی ئەبوذەر.

١٢٣٢: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ ثَابِتٍ قَالَ سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَخْطُبُ يَقُولُ قَالَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوزەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك لە پیاوان لە دونیا ئارمووش لەبەر بکا، لە ئاخرەت لەبەرناکا با بشچێتە ناو بەهەشت، بەڵکو خودا اقناعی دەکا و جلکی ئارمووشی لەبیر دەبا(لەدواجار لە خۆشی پۆشینی جلکی ئارمووشی سندس و استبرق نائومێد و بێبەش دەبێ) خودایان لە نیعمەتانت بێبەشمان نەکەی.

١٢٣٣: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لا يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعًا أَوْ لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرموویتی: نەکەن یەکێکتان بڕوا بەیەك لنگەپێڵاو، یا هەردوو لنگەپێڵاو لەپێ مەکەن پێکەوە، یا هەردوو لنگەپێڵاو لەپێ کەن (چونکی لە کەسی خاوەن پیاوەتی ناوەشێتەوە قاچێکی بە پێڵاو بێ قاچێکیش پێخواس).

١٢٣٤: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ لِيَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەکوو یەکێکتان پێڵاوی لەپێکرد، با بەقاچی ڕاست دەست پێبکا، وەکو لەپێشی دارنی با بەقاچی چەپە دەست پێ بکا، با قاچی ڕاست یەکەمیان بێ بۆ لەپێکردن وە ئاخریان بێ بۆ دارنین.

١٢٣٥: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ فَلا يَنْقُشَنَّ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەنەس ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی دروست کرد لە زیو بەسێ دێڕ محمد رسول الله لەسەر قاشەکەی هەڵکەنرا: دێری یەکەم (محمد) دێری دووەم (رسول) دێری

سێیەم (الله) ئنجا فەرمووی: من ئەنگوستیلەیەکم دروست کردووە لە زیو لە قاشەکەم هەڵکەندووە محمد پێغەمبەری خودایە، پاشان هیچ کەسێك مۆری خۆی نەقش نەکا لەسەر نەقشی مۆری من، بڵێن ئەمەیش سونەتێکە(چونکی نامەی پیرۆزی بۆ شاه و ملوکان دەچوو دەبوایە بە لەقەبێکی مەخصوص و تایبەتی بە شەئنی رسالەت پەناهی خۆی ئیمزا بکرێ، ئەگەر یەکێکی تریش ئەمەی بکردایە گۆڕین و التباس پەیدا دەبوو.

(ش): لای شافعی وا باشە ئەنگوستیلە لە دەستی ڕاست بکرێ..

## ١٢٣٦: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عەباس‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ لەعنەتی لە پیاوی موخەنەث (نەژن و نەمێرد) کردووە وە لەو ژنەش کە جلکی پیاو لەبەر بکا و خۆی وەکو پیاو لێبکا.. وە فەرمووێتی: دەریان کەن لە خانوەکانتان.

(ش): مخنَّث: موشتەقە لە (انخناس) بە مەعنا لەناو یەك شکان و تەکەسورە، ئنجا موخەنەث لە پیاوان ئەمەیە قسەکانی نەرم بێ لە ئەندامەکانی تێك شکانێك و تەکەسورێك هەبێ، ئالەت و ئەندامێکی وای نەبێ بتوانی لەگەڵ ژندا جووت بێ(واتا جماع بکا).

(مترجِّلة)یش ئەم ژنەیە خۆی کردوبی بە پیاو لە جلکی پیاوان دابی، بەم تەرزە چەك و ئالاتی جەنگی هەڵبگری و بەبێ سەرپۆش لەناو پیاوو ئافرەتان بگەرێ سحاقیان لەگەڵ بکا. یەعنی سواری ئافرەتان ببی-پان پانۆکییان لەگەڵ بکا- پێغەمبەرﷺ بادیەی کچی غیلانی دەرکرد لە مەدینە هەتا زەمانی حەزرەتی عومەر لە دوایی تەمەنی بە پیری بۆ دەرۆزەو سوال کردن هاتەوە مەدینە.

## ١٢٣٧: عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر‌ﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: موخالف و پێچەوانە بن لەگەڵ مەجووس، ڕیشتان بەردەنەوە زۆری بکەن وە سمێڵەکانیشتان لە سورایی هەردوو لا لێوتان پاك بکەنەوە (یەعنی لێوتان تەواو دیار بێ) بەر سمێڵی خۆتان بکەن.

(ش) مەبەست لە تەوفیری ڕیش پڕ بەناو دەستە زیاد لەمە هەڵقاچین باشترە.

١٢٣٨: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: جوولەکەو دیان مووی سپی خۆیان ڕەنگ ناکەن، ئنجا ئێوە موخالفی ئەوان بن. (یەعنی ڕیشتان وەکوو سپی بوو بە سۆر و زەرد ڕەنگ بکەن، بە ڕەنگی ڕەشی خاڵس مەمنوعە بۆ غەزا نەبێ. یەکەم کەس کە ڕیشی لە خەنە گرت لە عەرەب عبدالمطلب بوو.

١٢٣٩: عَنْ ابْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هَذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ.

(تەرجەمە)

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عومەرﷺ گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوان کەسانەی کە وێنەی حەیواناتی گیاندار دەکێشن عەزاب دەدرێن ڕۆژی قیامەت، پێشیان دەگوترێ زیندووبکەنەوە ئەم وێنانەی کە دروستتان کردوونە.

(ش): بەڵام وێنەی کێو و دار و ڕەز و باغ و شتی وا زەرەری نییە، بۆ زیادە زانیاری بگەڕێوە سەر حەدیسی ژمارە (٥٨٩) کە لە بەرگی چوارەم یلاوکراوەتەوە لەگەڵ حەدیسی ژمارە (٥٦٤) لە هەمان بەرگ.

بەرگی نۆیەم دوایی هات

چاوەڕێی بەرگی دەیەم بن بە هیوای یەزدانی پاك.